له ئیوه و هەمو پ م ئەکەین کەوا هەر کاتیک گەلی کورد گەیشتە ئاواتی خۆی لە بیرمان نەکەن وە منال و دایک و باوکی هیچ شەهیدیک لە بیر نەکەن وە خوینی ئیمە ئەکەویتە سەرشانی ئیوە بۆ تولە سەندن لەو دوژمنانەی وەک سمکۆی حاجی خورشید، محەمەد ئەمین رەشاشچی، عەبدوللا ماویلی، ئەنوەر شیخ ، مستەفا روستایی. پیویستە ئیوە تولەمان بسینن. تکایە دەستی یارمەتی بۆ کەسوکارمان دریژ کەن. تکا ئەکەم مام جەلال مەقالەیەکمان دەربارە بنوسی بۆ ئەوەی کەسوکارمان زیاتر شانازی بە خۆیانەوە بکەن.

ئیتر بۆ پیشەوە لە ژیر ئالای یەکیتیی نیشتمانیی کوردستان.

سەرکەوتن بۆ کورد و کوردستان. مردن و سەرشۆری بۆ دوژمنانی گەلەکەمان

شەهیدان:

رەسول عومەر خەیات حسین عومەر شیوەلوکی رەقیب عوسمان روستایی

رۆژی ۱۹۷۹/۲/۲.

*

ئەو کاتەی ئەم نامەیەمان بلاو کردەوە، عەولا ماویلی هیشتا ئامیر «مەفرەزە خاصە» ی جاش بو. عەولا ماویلی دوای ئەوەی بوبو بە جاش چەند پیشمەرگەی تریشی راو کرد بو، وەکو ئەیانوت: هەندی پیشمەرگەی گیراوی لە هالیکوپتەرەوە فری دابوە خواری.

هاتنی عەولا بۆ لای حشع و، سورانەوەی بە بەرچاوی پیشمەرگەکانی یالەکایەتی و، هاوری و ئاسیاوەکانی وەستا رەسول و حسین و رەقیب، تورە بونیکی زوری لە ناودا دروست کرد بون. ئەم گلەییە گەیشتە سەرکردایەتی و، هەرەشەیان کرد بو کە ئەگەر لەو ناوچەیە دوری نەخەنەوە بۆ ناوچەیەکی تر، لە تولەی خوینی هاوریکانیان دا، ئەیکوژن.

بۆ ئەوەی ئەم گرژییە برەویتەوە، مامجەلال داوای لە حشع کرد بو لەو ناوچەیە دوری بخەنەوە و بیگویزنەوە بۆ شوینیکی تر. حشع بانگیان کرد بۆ لای خویان بۆ ناوزەنگ، بەلام دوای چەند روژی ریگایان دا بو بروانەوە بۆ بارەگاکەی خویان لە وەرتی. رۆژی ٤ ی ئەیلول پیشمەرگەکانی یەکیتی لە دەرگەلە توشی ئەبن. کەوت بونە دوای، خوی لە مالیک دا قایم کرد بو، دەوری مالەکەیان دابو، داوایان لی کرد بو بیتە دەرەوە. ترسا بو بیکوژن خوی لە مالەکەدا عاسی کرد بو. بوبو بە تەقە. ئەم بەزمە ماوەیەکی خایاند بو سەرەنجام کوشت بویان.

لیپرسراوەکانی حشع لە ناوچەکەدا لەمە زور تورە ئەبن. یەکیتی کی یە و ئەوان کین، تا بتوانن دەستدریژییان بکەنە سەر و، هاوری ی حیزب بکوژن. ئەوانیش بیریان لە تولە کرد بوەوە، بەلام نەک لەوانەی کە ئەو کارەیان ئەنجام دابو، بەلکو وەکو خیلە دواکەوتوەکانی کورد، لە هەر یەکیتییەکی کە بەر دەستیان بکەوی.

روژیک دوای ئەم روداوە، فەرماندەی بەتالیونیکیان بە ناوی عەلی حەمە عەزیز، کە بە عەلی کلاشینکوف ناسرا بو، لە گوندی فەقییان ئەبی، چەند پیشمەرگەیەکی یەکیتی یش کە خەلکی ناوچەکە بون لە هەمان گوند ئەبن. بۆ گفتوگۆ ئەنیری بە دویان. ئەوانیش: وەسمان بەگی گەرموانی، فەرماندەی کەرت، لە گەل کادریک بە ناوی حەمە لاو و چوار پیشمەرگەی کە، بی سل کردنەوە ئەچن بۆ مزگەوتەکە کە عەلی لی ئەبی. عەلی لە ناو مزگەوتەکەدا دەسبەجی هەر شەشی کوشت بون.

وەسمان بەگ، جوتیارێکی هەژاری خەلکی گەرموان و، پیاوێکی بەرێزی ناوچەکە بو. لە شورشی ئەیلول دا پێشمەرگە بو. لەم شورشەیش دا هەر لە سەرەتاوە دەستی داپوەوە چەک و بوبو بە پێشمەرگە. کە یەکەم تاقمی حشع گەیشتنە ناوزەنگ، ئەوساکە ئەم بارەگایەکی پچوکی لە کەورگێک دا بە وشکە کەلەک لە ناوزەنگ دروست کرد بو، سەرکردایەتی یەکێتی ئەشکەوتەکەیان پێ چۆل کرد بۆ ئەوەی فاتیح رەسول و مەلا ئەحمەدی بانیخیلانی و شیوعیە تازە راکردوەکان وەکو نوایەکی زستانە بچنە ناوی.

لەو کاتەدا کە وەسمان بەگ کوژرا بە ئیجازە بۆ سەردانی منالەکانی چوبوەوە ناوچەکە.

ئەم دەستدرێژییە نارەوایە پێشمەرگەکانی یەکێتی لە بالەکایەتی وروژاند. ئەوانیش کۆبونەوە چونە سەر بارەگای بەتالیونەکەی حشع لە وەرتێ. شیوعیەکان دایانە چیای کاروخ و، دامەزران. لە شاخەکە گەمارویان دان. حشع ئاگاداری مامجەلالیان کرد، ئەویش فەرمانی دا کە دەسبەجێ دەوری شیوعیەکان بەر بدەن و، هەر کەسە بچێتەوە جێگای پێشوی خوی.

شەڕەکە کوژایەوە، بەلام گرژی ئەرموی بوەوە.

*

وەکو ئەمان بیستەوە لە ناو حشع دا لە سەرەتاوە دو بیروڕای جیاواز هەبو بەرامبەر ناکوکی پارتی - یەکێتی، دواییتریش لەو بەلگانەدا کە دەس یەکێتی کەوتن، هەندی لە مەحضەرەکانی کۆبونەوەکانیان ئەم هەوالەیان سەلماند:

١. هەندێکیان لایان وابو کە پارتی خەتەر نیە بۆ سەر حشع، چونکە حیزبێکی خێلەکی ناسراوە بە کۆنەپەرستی و نۆکەرایەتی ئێران و ئیمپریالیزم، بەلام یەکێتی خەتەرە چونکە بە ناوی مارکسیزم و پێشکەوتنخوازییەوە لاوانی کورد فریو ئەدا و، لە جەماوەری حشع ئەخوا. لە بەر ئەوە لەو ناکوکییەکەدا چاکتر وایە لایەنی پارتی بگرن.

٢. هەندێکی تریان لایان وابو ناکوکییەکانی نیوان لایەنەکانی جود - یەکێتی ناکوکی نیوان بالەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی بورجوازی کوردە، چەندی بە یەکەوە خەریک بن زورتر یەکتری لاواز ئەکەن و، هەلوێستی حشعی پێ بەهێز ئەبێ. لە بەر ئەوە چاکتر وایە کە حشع خۆی لەو ناکوکییانەوە نەگلێنی و لێ بگەرێ یەکتری بخۆن.

سەرەنجام بیروڕای ئەوانەی یەکەم سەری گرت کە بە لای پارتی دا دابشکێن، وەکو ئەیانوت: لە سەرەتاوە مەلا ئەحمەدی بانیخیلانی لەم باوەرەدا بو، دواتریش کەریم ئەحمەد چوە سەر باوەرەکەی ئەو.

*

کە پێشمەرگەکانی حشع بارەگای بەتالیونەکەیان چۆل کرد بو، پێشمەرگەکانی یەکێتی هەندی کاغەز و دەفتەریان لە ناو بارەگاکە دەرهێنابو دواییتر بۆ منیان هێنا. یەکێکیان دەفتەرێک بو بە عەرەبی ناوی پێشمەرگەکانی بەتالیونەکە و، سال و شوێنی لە دایکبون و پلەی پێشمەرگایەتییان و هەندی زانیاری لەو بابەتانەی تێ دا نوسرا بو. ئەوەی سەرنجی راکیشام ئەوە بو: لە تەنیشت ناوی زۆریانەوە لە خانەیەک دا نوسرا بو «متعهد». من وامزانی مەبەستیان لە «متعهد» قونتەراتچی و «مقاول» ە. سەرم سورما بو لەوەی ئەو هەمو قونتەراتچییە لە حشع کۆ بوبێتەوە. لە چەند کەسێکم پرسی. یەکێ لە هاورێکانم شارەزا بو وتی: «مەبەستیان لە - متعهد ئەوەیە کە پاکانەی بۆ بەعس نوسیوە و بەلێنی

پی داون ریزی حشع به جی بهیلی!»

*

لەشکرکیشیەکەی سەید کاکە

سەید کاکە زۆر جار لای سەرکردایەتی حیزبەکەی خۆی هەلکیشا بو کە ئەگەر ئەوان لی ی بگەرین یەکیتی لە کوردستان دا تەواو ئەکا. ئەوانیش باوەریان پی کرد بو. کە رووداوەکەی شیرکۆ بو، فەرمانیان دا بە سەید کاکە، بچیتە سەر هیزەکانی یەکیتی. سەید کاکە، کە خوی هەمیشە بە دوای بیانودا ئەگەرا بۆ پەلاماردانی یەکیتی، هەلی بۆ هەلکەوت. لەو کاتەدا لە دەوروبەری وەرتی و مەلەکان بو. کەوتە کوکردنەوەی پیشمەرگەکانی حسک. لە قسەکانی دا کە بۆ دانیشتوانی دیهاتەکانی کرد بو، وت بوی: «ئیمە چوار حیزبین و ئەوان تەنیا یەک حیزبن. بریارمان داوە جاشەکانی شەستوشەش بکەینەوە بە تەویلەکانی یەکرەجوزدا!»

سەید کاکە رۆژی ۲۳ ی ئابی ۸۱ لە خوشناوەتیەوە کەوتە کیومال بە دوای پیشمەرگە و کادرەکانی یەکیتی دا. هەر پیشمەرگەیەکی بەر دەس کەوت چەکی کرد و، هەر تاقمیکی بینی چوە سەریان. لە چیوە و دولی نازەنین و دۆلی سماقولی زیاتر لە ۵۰ کادر و پیشمەرگەی بە تاک و بە کۆمەل چەک کرد و هەندیکی کوشت و هەندیکی زامار کرد.

*

بۆلی و کۆمەلە

رۆژی ۲ ی ئەیلول سەید کاکە دەوری مەفرەزەیەکی یەکیتی گرت لە گوندی میوژەی بناری کوسرەت. پیشمەرگەیەکی کوشت و دوانی بریندار کرد. یەکیکیان فەقی بایزی لیپرسراوی مەفرەزەکە بو، ئەوانی تریشی گرت. یەکی لە گیراوەکان ئەنوەر بۆلی بو. سەید کاکە لی ی پرسی بو سەر بە چ ریکخستنیکە وت بوی: «کۆمەلە». سەید کاکە بە گوچان تی ی بەر بوبو. هەتا توانی بوی لی ی دابو. زۆریشی جنیو پی دا بو، وت بوی: «ئیوە هەمو شوانن، بۆلی و کۆمەلە کوچا مەرحەبا!». بۆلی تیرەیەکی پچوک بون لە بیتوین ئەژیان. خۆیان بە بەشی لە ئاکۆ دائەنا. ئاژەلدار و نیوە رەوەند بون. کاتی خۆی لە نیوان قەندیل و دەشتی کۆیەدا گەرمیان و کویستانیان کردوە.

هەرکەس ئەم قسەیەی بکردایە، نەئەبو سەید کاکە قسەی وەها بکا، چونکە ئەویش بە هەرزەکاری شوان بوە و، پلەی خویندەواری خوی و رادەی تیگەیشتنی لە هی ئەنوەر بەرزتر نەبو. لە کاتیک دا ئەم خۆی بە سەرکردەی حیزبیکی سوسیالیستی ئەزانی، ئەنوەر ئەندامیکی سادەی کۆمەلە بو. بۆ بەدبەختی کورد، بە هۆی هەلومەرجی ناتاسایی جولانەوەی کوردەوە زۆر جار لە ناو هەمو حیزبەکان دا کەسانی لە بابەتی سەید کاکە ئەگەیشتنە ناوەندی بریاردانی سیاسی.

*

فەخرەدین

لە مزگەوتەکەی گوندی ئاومالی دەشتی کۆیە دەوری چەند پیشمەرگەیەکی یەکیتی گرت. پیشمەرگەکان دەستیان کردوە. یەکیکیان کوژرا ناوی فەخرەدین و، دەرچوی کلیەی علومی زانکۆی موسل بو. کادری ریکخراوەیی کۆمەلە بو.

*

### حاجی قادری مالومه

سەید کاکە لە دۆلی جافەتی چو بو، سەرگەلو، هەلەدن، یاخسەمەر، چۆخماخ مالومە.. لە چەند شوێنی تەق و تۆقلی لە گەل پێشمەرگەکانی یەکێتی دامەزراند بو. ئازاری دەستەکانی یەکێتی دابو. هێزەکانی یەکێتی لە وێ کە تازە فەرماندەکەیان و، چەند فەرماندەی کەرتێکیان کوژرا بو، خەمبار و سەرگەردان بون، کە بیست بویان هێزەکانی حسک هاتوتە سەریان، پاش تەقوتوقێکی کەم کشا بونەوە دۆلی سەفرە و زەروێن.

حاجی قادری مالومە کە بە ناوی: «دیگەل» ناوبانگی دەرکرد، یەکێ بو لە پیاوە ناسراوەکانی ناوچەکە. پیاوێکی کوردپەروەر و بەرێز و، تەمەنی سەرو ٦٠ ساڵ و، لە شۆڕشی ئەیلول دا ماوەیەکی درێژ پێشمەرگایەتی کرد بو. مامە عەزەی برایشی سەرەتای دەس پێکردنەوەی شۆڕشی نوێ پێشمەرگەی یەکێتی بو، لە هێرشی جەیش دا کوژرا بو. حاجی قادر بە خوێ دا راتەپەڕمو لە روی هەمو کەسێک دا قسە بکا. هەندێ مشتومڕی لە گەل سەید کاکە کرد بو. سەید کاکە بو شکاندنی حاجی قادر لە بەر چاوی خەلک، لە حەوزی مزگەوتەکەی مالومەی هەلکێشا بو.

*

### دلشاد تۆفیق

لە گوندی شارستێنی دۆلی جافەتی، کە دوا قۆناغی لەشکرکێشیەکەی بو دلشاد تۆفیق کوژرا. دلشاد نەوەی شاعیری کوردپەروەر: حاجی باقی بەنگینە و، خوێندکاری زانکۆ بو دەستی لە خوێندن هەلگرتبو. ماوەیەک لە قەندیل و ماوەیەک لە ناوزەنگ لە گەل من پێشمەرگە بو. گەنجێکی ژیر و بێدەنگ و ئازا بو. کادری رێکخراوەیی کۆمەلە بو.

*

### د. مەجید

هەر لە درێژەی ئەم لەشکرکێشیەدا رۆژی ٦ ی ئەیلول تاقمێکی تری هێزەکەی سەید کاکە جارێکی تر چونە سەر هێزێکی یەکێتی لە چیوەی سەرو پێشمەرگەیەکیان کوشت بە ناوی هاشم و دوانیشیان بریندار کرد یەکێکیان د. مەجید عەبدوللا بو. د. مەجید تازە خوێندنی پزیشکی تەواو کرد بو. هاوڕێ ی کۆمەلە و، گەنجێکی روح سوک و رۆشنبیر و روخۆش بو. بۆ خزمەتی پێشمەرگە و خەلک لە گەل پێشمەرگەکانی دەشتی هەولێر مابوەوە. گوللەیەک لە کەللەی سەری دابو توشی بێهۆشی و شەلەلی کرد. هاوڕێکانی بە برینداری دەربازیان کرد بو. ماوەیەک لە چیا و ماوەیەک لە گوندی وەری شارد بویانەوە. پاشان بۆ تەداوی نێردرا بۆ سوید. بەلام هەرگیز چاک نەبوەوە و ئیتر نەیتوانی پزیشکی بکا.

*

هێزەکەی سەید کاکە زورتر نەبو لە هێزەکانی یەکێتی، بەلام هێزەکانی یەکێتی وەکو جاران بە بێ ترسی دەستدرێژی حسک بە تاقمی پچوک و لە یەک دابراو بە ناوچەکانی چالاکی خۆیان دا ئەسورانەوە. سەرکردایەتی یەکێتی هیچ جورە بریارێکی نەبو بۆ شەری حسک، حشع و پاسوک. هەر لە بەر ئەوە ئاگاداری پێشمەرگەکانیش نەکرا بو

وریایی خۆیان بکەن و، کۆ ببنەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی سەید کاکە. سەید کاکە نەیتوانی غافلگیریان بکا و، دەستی کتوپڕیان لێ بوەشێنێ و، بە جێیان بهێڵێ.

*

ئەم هەواڵانە کە گەیشتنەوە ئێمە زۆر نارەحەتی کردین. ئەم لەشکرکێشییە لە سنوری تۆژلە دەرچو بو، بوبو بە شەری دەرپەراندن. سەید کاکە لە نامەیەکیش دا کە بۆ مەکتەبی سیاسی خۆیانی نارد بو، داوای لێ کرد بون هێزێک بنێرنە سەر مامەندە بۆ ئەوەی ئێمەش لە شێنێ، زەلی، ناوزەنگ، تۆژلە.. دەربکەن. وتبان: «ئەگەر وا بڕوا ئەبێ کوردستانی بۆ بە جێ بهێڵین.» بۆ هەڵسەنگاندنی بار و دۆخەکە کۆبونەوەیەک کرا ئەندامانی م س و زۆری سەرکردایەتی بەشدار بون.

لە پێشەوە رەخنەی زۆرمان لە مەلا بەختیار گرت لە سەر کارەکانی ئەو دواییەی و، لە سەر بە جێ هێشتنی پێشمەرگەکان و ناوچەکە. داوامان لێ کرد سەر لەنوێ بچێتەوە بۆ سەرپەرشتی و رێکخستنەوەی هێزەکانی هەرێمی چوار. هەرچی لە گەڵی مان وت، کەڵکی نەبو، ئامادە نەبو بچێتەوە بۆ ناوچەکە. بڕیارمان دا:

١. مستەفا چاورەش بچێ بۆ کۆکردنەوە و رێکخستنەوەی هێزەکانی هەرێمەکانی ٣ و ٤ و، تێبن بو سەید کاکە و هێزەکانی حسک بهێنێ بەری مەرگە و دۆڵی جافەتی بە جێ بهێڵن بەرەو کوسرەت و، لەوێش گوشاریان بو بهێنن تا ئەیانکەنەوە بە خۆشناوەتی دا.

٢. من، هێزێک لە گەڵ خۆم ببەم بە ناوچەی مەنگوڕایەتی دا بەرەو دۆڵی خانەقا و، دەس بگرین بە سەر ناوچەکانی وەرتێ، دۆڵی مەلەکان و، دۆڵی بالیسان دا. لەوێ لە گەڵ هێزەکەی مستەفا یەک بگرینەوە، هێزەکانی حسک بخەینە «ناو کەماشە» وە.

٣. مەلازم عومەریش، ئەگەر پێویستی کرد، بە دوای من دا هێزێک بهێنێ لە قەلاتوکان دابمەزرێ بۆ پاراستنی رێگاکانی پشتەوەمان لە کۆمتان - دۆڵی خانەقا.

لەو کاتەدا بەشێکی هێزەکانی هەرێمی ٧ ی بالەک و هەرێمی ١٤ ی ئاکۆ لە سەرکردایەتی بون. هەموانم ئاگادار کرد خۆیان بۆ جوڵان کۆ بکەنەوە. سەید کەریم لە باتی م ع هات. چەند مەفرەزەیەکی گەرمیان لەوێ بون ئەوانیشمان ئاگادار کرد خۆیان ئامادە بکەن.

مستەفا لە سەردەشت بو ئاگادارمان کرد بە رێ بکەوێ بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی.

*

روداوەکانی فەقێیان و کاروخ، لە نێوان حشع و یەکێتی دا تازە قەوما بو. هەردولا بڕیاریان دابو کە پەیوەندییەکانیان لە ناوچەکەدا ئاسایی بکەنەوە. یەکێتی ئەم کارەی بە من و، حشع بە مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی سپارد بو.

بەیانی رۆژی ٨ ی ئەیلولی ٨١ هێزەکەمان کەوتە رێ، مەلا ئەحمەدیش لە گەڵ ئێمە هات، بەلام لە رێگا سلی لێ ئەکردین. لە قەلاتوکان لامان دا. لە کاتی نان خواردن دا عەلی حەمەی شاسوار، کە ئەوسا گەنجێکی تازە پێگەیشتو بو، تفەنگەکەی لە سەر پێ نەبی، گوللەیەکی لە دەس دەرچو رانی پێشمەرگەیەکی مەفرەزەکەی خۆیانی پێکا. ناوی هیدایەت و خەڵکی ئاوایی بنەکەی گەرمیان بو. د. شالاو لە گەڵ هێزەکە بو. گەیشتە سەری. دەمارە گەورەکەی رانی توشی نەزیف ببو. چەندی خەریک بو نەزیفەکەی

بوەستێنی و، چەند کەسێکیش خوێنیان دابە، کەلکی نەبو، هەمان ڕۆژ مرد و، لەوێ ناشتمان. ئەمە ڕوداوێکی ناخۆش بو، هێشتا هیچمان نەکرد بو یەکێکمان بە خۆڕایی کوژرا.

گۆڕستانێکی زۆر گەورە لە قەلاتوکان بو. گەورەیی گۆڕستانەکە لە گەڵ کەمیی ژمارەی دانیشتوانی قەلاتوکان و ئاواییەکانی دەوروبەری دا نەدەگونجا. هەندێ لە گۆڕەکان هەڵبەسترا بون. نیگاری گوڵ و خەنجەر و مەلێکی لە بابەتی کەلەشێر لە سەر کێلەکانی هەڵکەنرا بو. نوسینیان لە سەر نەبو، یان من نەمبینی. نەمزانی هی چی سەردەمێکە.

ڕۆژی دوایی کەوتینە ڕێ گەیشتینە دۆڵی خانەقا. پێشمەرگەکانی دەشتی هەولێر و خۆشناوەتی کە لە ناوچەکەدا مابونەوە تا ئەو کاتە خۆیان حەشار دابو، بە هۆکی تۆزێ دۆزرانەوە و خۆیان دەرخست. د. مەجیدیش، کە چەند ڕۆژ بو بە برینداری حەشاریان دابو، لە دارمەیتێک دا گەیشتە دۆڵی خانەقا. سەرەرای سەختی برینەکەی و پەرێشانی حاڵی، وەرەی زۆر بەرز بو. لە گەڵ مەلا ئەحمەد چەند جاری دانیشتین و، نوێنەرانی هەردولامان دانا و، ئەو چەکانەی لە یەکتریان گرت بو وەرمانگرتەوە دامانەوە بە یەکتری. ئەبو نێوانی هێزەکانی هەردولا لە ناوچەکەدا بگەڕێتەوە دۆخی جارانی.

بەلام وەکو دوایی بۆمان دەرکەوت ئەمە بۆ خاوکردنەوەی ئێمە بو، چونکە سەرکردایەتی جود بڕیاری دابو: یەکێتی تەمێ بکا.

*

هێزەکەمان بە ڕێ کەوت بەرەو مەلەکان. بەیانی زو بو گەیشتین. پیاوەکانیان کە بە هاتنی ئێمەیان زانی بو هەمویان لە ترسان خۆیان لە چیا شارد بوەوە. ئەو ڕۆژە هەینی بو، لە بەر ئەوەی پیاوەکانی ئاواییەکەیان بە جێ هێشت بو، نوێژی هەینی تێ دا نەکرا. هێزەکەمان زۆر بو هەمووی لە مەلەکان جێیان نەئەبوەوە، لە بەر ئەوە دابەشمان کردن بە درێژایی دۆڵەکە لە گوندەکانی: کەندول، بلەی سەرو، بلەی خوارو، ئالانە.. دامەزرین.

کادرەکانی یەکێتی، هەواڵی ناڕاستیان لە سەر ژمارە و شوێنی هێزەکانی حسک هەبو. پێیان وت بوین کە دۆڵەکە چۆڵە و، هێزی حسکی تێ دا نەماوە. بەلام کە هێزەکانی ئێمە چون بۆ بلێ، لە چیاکانی پشتەوە: سەری جوانەگا، دارە هێشک، گەلی بیجان، کە بەشێکی زنجیرەی چیای کورەکە.. بویان دامەزرا بون، دایاننە بەر دەستڕێژی گوللە. یەکێکیان لێ کوشتین و چەند کەسێکیشمان بریندار بون.

هێزێکمان ناردە سەریان. شوێنەکانیان زۆر قایم بو. خەلکی ناوچەکەش بە نهێنی هاوکاریان ئەکردن. بەرەنگارییەکی سەختیان کرد. سەرەنجام هەڵکەندران و بڵاوەیان لێ کرد و خۆیان شاردەوە. بۆ ئەوەی نەتوانن بێنەوە ناو گوندەکان بە درێژایی دۆڵەکە لە ناو هەمو گوندەکان دا بنکەمان دانا و، لەو شوێنانەش کە ئەیانتوانی هاتوچوی لێوە بکەن بۆسە و ڕەبیەمان دانا.

زنجیرەیەک چیای زۆر سەخت کەوتوتە نێوان دۆڵی شاور و دۆڵی مەلەکان و دۆڵی بالیسانەوە، چەند کوێرە ڕێگایەکی هەیە بۆ هاتوچو بارێک و بەرز و ڕک و ڕژدن، خۆیان پێیان ئەلێن: «دەرە»، وەکو: دەرە هەرتەل، دەرە زیوە کە ڕێگایە بو دۆڵی شاور و، دەرە شێر کە ڕێگایە بو سەرچاوەی مەلەکان و، ڕێگای سەرپاری خەتێ. هەمو ئەم شوێنانەمان بە پێشمەرگە تەنی، چونکە چاوەڕوانی گەڕانەوەی سەید کاکەمان ئەکرد کە لە دۆڵی جافەتیەوە

راو نرا بو بەرەو کوسرەت و، ئەبو بە یەکێ لەم ڕێگایانە دا تێ پەڕی بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بارەگای سەرکردایەتیيان لە ئەوبەری دوڵە تو.

ڕۆژانەیش مەفرەزەکانمان ئەچون بۆ گەڕانی گوندەکانی دوڵی بالیسان.

هەمان ڕۆژی گەیشتینە مەڵەکان، دوای ئەوەی تێگەیشتن نیازی هیچ دەستدرێژی و کارێکی خراپمان نیە بۆ ئێوارەکەی، هەمو ئەوانەی هەڵات بون هاتنەوە ناو ماڵەکانی خۆیان. دوا بە دوای یەک هەندێ لە پێشمەرگە و مەفرەزەکانی حسێک، کە خەڵکی ناوچەکە بون ئەوانیش لە مەکۆکانیان ئەهاتنە دەرێ و، ئەهاتنە ناو یەکیتیەوە. هەندێ لەوانە پێشمەرگەی باش و ڕێکوپێکیان لێ دەرچو، تا سەر لە گەڵ یەکێتی مانەوە.

*

## دیموکرات

یەکێ لە پێشمەرگەکانی دەستەکەی خۆم ناوی جەمال بو. هاوڕێ ی کۆمەڵە بو. بەرپرسی کاروباری لوجستیکی مەفرەزەکەمان بو. سەرپەرشتی خواردن و دابەشکردنی ئەکرد. کابرایەکی مەڵەکی دارێکی هەرمێ و دو بن دار گوێزی بۆ خواردنی خۆمان بەرەو ڕو کرد بوینەوە. چارویار گوێز و هەرمێیان لێ ئەکردە و ئەیانخوارد. جەمال سەرپەرشتی چنین و ڕنین و دابەشکردنی ئەکرد. لە باتی ئەوەی بڵێ: وەکو یەک بە سەرتان دا دابەش ئەکەم، ئەوەندە وت بوی: بە دیموکراتی دابەشی ئەکەین. ناویان نا: «جەمال دیموکرات» دوای ئەوە ئیتر ئەم ناوەی بە سەردا دابڕا و، هەتا ئێستایش هەروای پێ ئەڵێن.

*

## قەل

لەو سەردەمەدا دەزگای بێتەل مان نەبو، تەنیا هوی پەیوەندی مان چەند دانەیەک هوکی توکی بو. بۆ ئەوەی لە گەڵ یەک پەیوەندی بکەین ئەبو بچوینایەتە لوتکەی بەرزاییەکان. ئەو مەفرەزانەی لە بوسەی سەر ڕێگاکان دا دامنابون هەمویان هوکی توکیيان پێ بو، بۆ ئەوەی ئەگەر شتێ هاتە پێشەوە بە تایبەتی شوێنەکانیان ئەیروانی بە سەر دوڵی بالیسان دا ئاگادارم بکەن.

شاخەوان فەرماندەی ئەوانە بو کە لە سەر باری خەتێ و، فاروقی عەلی مەولودیش هی ئەوانەی لە سەر دەرە شێر بون. بۆ ئەوەی بە ئاسانی لە پەیوەندییەکانمان تێ نەگەن، هەندێ لە ناوەکانمان گوڕی بو، لەوانە: وشەی «قەل» مان بۆ حسک دانا بو.

لە پڕ شاخەوان بە هوکی توکی هاواری کرد: «ئەری وەڵلا ئەوە قەلەکانن! ئەوە قەلەکان لە ئوتومبیل دابەزین. ئەوە قەلەکان خەریکن بە سەر باری خەتێ دا هەڵئەگەڕێن. ئەوە قەلەکان بەرەو لای ئێمە دێن...» بەمجورە، بە بێ پسانەوە، درێژەی ئەدا بە قسەکانی ئەتوت مونەیدی پەدریە و لە سەر ڕوداوەکانی توپتوپێن ئەدوێ. فاروقی عەلی مەولودیش هەمان قسەی شاخەوانی بە هوکی توکییەکانی تر ئەگەیاند. چەندێ هەولم دا شاخەوان بە بێدەنگی چاودێری قەلەکان بکا، تا ئەگەنە ژێر ئاگری ئەوان، کەلکی نەبو.

تومەز قەلەکان سەید کاکە و هێزەکەی بون و، ئەیانویست لە ڕێگای سەرباری خەتێ بێنە دوڵی مەڵەکان و بگەڕێنەوە بەرەو سەرکردایەتی، لەم هات و هاوارەی شاخەوان هوشیار بونەوە. ئەوانیش بە هوکی توکی قسەکانیان گوێ لێ ببو، زانی بویان بوسەیان بۆ دانراوە. بە هەمان ئوتومبیلی پێ ی هات بون، سوار بون و گەڕانەوە بۆ دواوە بەرەو چیای هەوری،

واته بەرامبەر بەو چیایەی هێزەکانی ئیمە بوی دامەزرا بون.
ئیتر ئیمە لە کولی نەبوینەوە. هێزەکانمان نیشتنە سەریان. لە لای چیوە و لە لای سەردزلەوە بە هەوری دا بویان سەرکەوتن. سەید کاکە بە هوکی توکی قسەی لە گەڵ عەولا سور کرد بو داوای لی کرد بو دەربازی بکا. شوێنیکی بۆ دیاری کرد بو بچیتە ئەوی تا بە تراکتور بیگوێزیتەوە. سەید کاکە هەندی لەوانەی لە گەلی بون خەریکی کردن بە شەری هێزەکانی یەکیتیەوە، خویشی بە دزییەوە مەیدانی بە جی هیشت بو بەرەو ئەو شوێنەی عەولا سور بوی دیاری کرد بو.
هیچ کەسی لە فەرماندەکانی پیشمەرگە بە ئەندازەی سەید کاکە لە خو دەربازکردن دا زیرەک نەبو، شەرەکەی داتەمەزراند، گەرمی ئەکرد، تاقمی لە پیشمەرگەکانی تیوە ئەگلاند، خویشی بە بیدەنگی ئەکشایەوە بۆ شوێنیکی سەلامەت. لە چەندین شەردا ئەم تاکتیکەی بە کار هینا بو. لە «شەری دەشتیو» یش دا وەها دەرباز بوبو.

*

شیر و ریوی
ئەم شەرە زیاتر لەوەی شەرە تفەنگ بی، شەرە قسە بو.
کە باسی ئازایەتیەکانی خوی ئەکرد، سەید کاکە قولی هەلئەمالی و، گیرانەوەکانی تیکەلاو ئەکرد بە هاژوهوژ و فیشال و خو هەلکیشان، بەلام قسە و فشە و هەرەشەکانی خوش بون، زور جار لە ناخوشی دا پیاوی ئەهینایە پیکەنین.
سەید کاکە هەمو فەرماندە ناسراوەکانی یەکیتی ئەناسی و، لە گەل هەندیکیان دوست و ناسیاو بو. لەم شەرەدا بە هوکی توکی قسەی لە گەل هەندیکیان ئەکرد، لە سەرەتادا کە هیشتا مەترسی لە سەر نەبو جنیوی پی ئەدان و گەفی لی ئەکردن. قەنناسەیەکی پی بو، هەرەشەی لی ئەکردن بە قەنناسەکەی، میشکیان ئەپرژینی! سەید کەریم و قادر خەیات و عەزیزی داود پیاوی زور ئازا بون هەرەشەکانی سەید کاکەیان بە فشە وەرئەگرت و گالتەیان پی ئەکرد. خەریک بون ئەگەیشتنە سەری.
لە چەند لاوە بە هوکی توکی بانگیان ئەکرد: «سەید ریوی لە کوی ی؟»
سەید کاکە ئەیزانی ئیتر خەریکە مەترسی لی نزیک ئەبیتەوە وتی: «شیر کە پیر بو ئەبیتە مەسخەرەی سەگان!» یەکیکی کە پی ی وت: «سەید ریوی! تۆ قەت شیر نەبوی، هەر ریوی بویت و، هەمو جار خەلکی لە شەرەوە ئەگلینی و خویشت هەلدی ی!» قادر خەیات گورانیەکی خوشی بە ناوی: «هۆ ریوی – ریوی...» بۆ ریکخست بو، بە ئاوازیکی خوش لە هوکی توکیەکەدا بوی ئەوت.
ماوەیەک سەید کاکە دەنگی نەما. زوریان گالتە بە خوی و بە قەنناسەکەی ئەکرد. ئەیانویست شوێنەکەی بدوزنەوە بەلام ئەو دەنگی لە خوی بری بو. تومەز خەریکی خۆدەربازکردن بو. سەید کەریم چەند جاری بانگی کرد: «سەید ریوی قەنناسەکەت دەنگی نەما چی لی هات؟»
سەید کاکە گەیشتە تینی، وتی: «چو بە .... دایکتا!»
سەیرە کورد لە ناو گیانداران دا، جگە لە شیر و پلنگ، ئەوانی کەی بە لاوە سوکە. سەید کاکە بە ناوی ریوی زۆر تورە ئەبو. ئەیئەزانی رۆمیل سەرکردەی هێزەکانی ئەلمانیا لە سەروی ئەفەریقا، کە هێزەکانی بەریتانیای بە سەرکردایەتی مۆنتوگۆمری بە گیر هینا

بو، له بەر زیرەکی له بەربوەبردنی شەرەکەدا ناویان نا بو: ریوی بیابان.
ئیتر بە یەکجاری نا دەنگی قەنناسەکەی و نە دەنگی خوی لە هوکی تورکی دا نەما.
بو روژی دوایی بیستمان کە عەولا سور لە ریگای سەرکەپکانەوە تی ی پەراند بو.

*

لە هەوری یەکیٚ لە هیزەکەی سەید کاکە کوژرا، ناوی حەسەن وەرتی بو، تەرمەکەی
بە جی مابو. پیشمەرگەیەکیشیان بە بریندار گیرا ئازادمان کرد. بەلام سەید کاکە خوی
دەرباز بو و، ئەوانی تریشیان بە تاقمی پچوک بلاوەیان لی کرد.
جمو جولی ئاشکرای چەکدارەکانی حسک نەما و، ناوچەکە کەوتە ژیر دەسەلاتی
هیزەکانی یەکیتییەوە.

*

بو روژی دوایی، بو هەلسەنگاندنی هەلومەرجی ناوچەکە و، دانانی بەرنامەی کاری
داهاتو، لە بیراوا کوبوینەوە. پیویستی ئەوە نەمابو هیزەکان هەمویان لەو ناوچانەدا بە
کوکراوەیی بمیننەوە. هیزەکان ریگا دران هەریەکەیان بچیتەوە ناوچەی چالاکی خوی. لەویوە
نامەیەکم بە ریگای ناوشار نارد بو فەرماندەی پیشمەرگەکانی بنکەی قەلاتوکان. ئاگادارم
کرد کە سەید کاکە لەو ریگایەوە ئەگەریتەوە بوسەیەکی باشی بو بنینەوە.-محەمەدی حاجی
عەبدوللا فەرماندەی پیشمەرگەکان بو، بە چاکی بوزیان دامەزرا بون، بەلام کە سەید کاکە
گەیشت بوە نزیکی، بە هەندی قسەی لوس فریوی دابو، ریگەی پی دابون بە سەلامەتی
تی بپەرن.
کوسرەت بوشایی تی دا دروست بو. ناوچەیەکی گرنگیش بو بو پیکەوە بەستنی
ناوچەکانی هەردو بەری زیٚ. شەمال کە ئەو کاتە فەرماندەی پیشمەرگەکانی دەستەکەی خوم
بو، حەزی کرد بچی بو کوسرەت. تاقمیک لە پیشمەرگەکانی خومم بو جیا کردەوە و، لە
گەل هەندی پیشمەرگەی تر بە ری مان کرد و، فەرماندەیی هیزەکەی ئەوی مان پی سپارد.

*

## گەلەکومەکیٚ ی چوار قزلی جود

پەیوەندی یەکیتی و لایەنەکانی جود چو بوە قوناغیکی ترسناکەوە. لە نیوان
یەکیتی و پارتی دا لە سەرەتاوە حالەتی شەر بەردەوام بو. دوای ئەو روداوانەش شەر لە
نیوان یەکیتی و حسک دا هەلگیرسا بو. بە هوی روداوەکانی دەرگەلە و قەقەبیان و
کاروخەوە پەیوەندی یەکیتی لە گەل حشع یش گرژ بو بو، لە گەل پاسوکیش لە روداوەکەی
مامەخەلان و گەرەدی تیکچو بو. بە واتەیەکی تر هەر چوار براکەی جود لە سەنگەردا بون
لە یەکیتی. سەرکردایەتی ئەم حیزبانە بە نهینی لە ناو خویان دا ریک کەوت بون
گەلەکومەکییەکی پیشمەرگەیی بکەن، یەکیتی لە مەیدان دەربپەرینن، یا هیچ نەبی تەمیٚ
ی بکەن.
ئیمە هیشتا پەیمان نەزانی بو. من بەرەو دوا گەرامەوە بو مەلەکان و، دوای چەند
روژی چومە دولی خانەقا بە نیازی ئەوەی بە یەکجاری بگەریمەوە بو ناوزەنگ لە بەر ئەوە
هیزەکەم کەم کرد بوەوە. هەر ٤٠ کەسیکم لە گەل بو. چەند روژی لە گوندەکانی دولەکەدا
مایەنەوە. روژانە شیوعییەکان تاقمیک و دوان و سیان بە ناوی کرینی ئازوقە و کەلوپەل و
پیویستی ترەوە بە لای ئیمەدا ئەهاتن، وەکو پیشمەرگەکان چاودیریان کرد بون، لەم سەر

بە کەمی ئەرویشتن، بەلام لەو سەر بە زوری ئەهاتنەوە. گومانیان وابو هیزیکی بیگانە، وردە وردە و بە شینەیی، ئەگویزنەوە بو شوینەکانی پشتی ئیمە.

*

### چاوەش

مەکتەبی سیاسی چەند جاری بە رادیو پەیامی مەجغوریان بو ئەناردم، کەوا عەولا سور ریگای کومتانی بەستوە، هەرکەس لەویوە ئەروا، ریگای پی ئەگری و لیکولینەوەیان لە گەل ئەکا. چەند پیشمەرگەیەکیشی چەک کرد بو، داوایان لی ئەکردم هیزیک بنیرمە سەری لە ریگاکە دوری بخەمەوە.

جاریکیان تالمی هونەرمەندی هەولیری لەویوە تی پەری بون. سەید کاکەش لەوی ئەبی. یەکی لە هونەرمەندەکان کەمان، یا ئالەتیکی موسیقی تری، پی ئەبی. سەید کاکە لی ی ئەپرسی: «بو کوی ئەچی؟» ئەلی: «ئەچم بو ناوزەنگ» سەید کاکە ئەلی: «مامجەلال کەسی بە دەستەوە نەماوە خەریکە چاوەش کو بکاتەوە!»

*

سوار ئاغا، عەولا سوری بانگ کرد بو لە سەر دەرباز کردنی سەید کاکە سەرزەنشتی کرد بو. بوی باس کرد بو کە یەکیتی و حسک لە شەردان، یارمەتیدانی ئەوان واتە دوژمنایەتی یەکیتی. چەند جاری قسەی لە گەل کرد بو کە یان بگەریتەوە ناو یەکیتی یان ناوچەکە بە جی بهیلی و بچی بو سەرکردایەتی حسک. چەند روژی ئەم مشتومرەیان بەردەوام ئەبی. مەلا عوسمانی پلنگان، عەزیز صدیق، رەئوف سلیمان و مامەندی حاجی صدیق لە هەندی لەم دانیشتنانەدا بەشدار ئەبن. زور لە فەرماندەی کەرتەکانی هەریمەکەش کە خەلکی ناوچەکە و هەندیکیان خزمی خوی بون هەر لە گەلی خەریک ئەبن. ئەم هەولانە نەک هەر هیچی سودی نابی، بەلکو بەوپەری بی باکی و بی منەتیەوە سور ئەبی لە سەر هەلویستی خوی و، پییان ئەلی: «چیتان پی ئەکری بیکەن!» تومەز ئاگادار بو کە هیزیکی گەورەی جود بە ریگاوەیە.

*

### کزلانی فاتە

«خانەقا» گوندیکی بچوک بو، دولەکەیش بە ناوی ئەم گوندەوە ناو نرا بو دولی خانەقا. جادەیەکی قیری بە ناودا تی ئەپەری سەنگسەری ئەبەست بە جادەی هامیلتونەوە. لەمبەر و ئەوبەری جادەکە گوندەکانی: بەرگردکە، سەرنەوس، بن نەوس، گوزجار، رەزیکەریان، چوم ریخن.. هەبو. ریگایەک لەم جادەیەوە ئەبورەوە ئەچو بو قەسری، یەکی لە پیچەکانی ناوی: «کزلانی فاتە» بو.

لە گەل پیشمەرگەکانی بالەکایەتی نیوانم زور خوش بو هەندی جار گالتەوگەپم لە گەل ئەکردن. عەزیزی داود پیاویکی قزشمە و قسە خوش بو، لە لاسایی کردنەوەدا زور وریا بو. ئەگەر لە ولاتیکی کە بوایە ئەیتوانی ببی بە ئاکتەریکی گەورە. روژیکیان وتم: «عەزە گیان ئەم فاتەیە چیتە؟» وتی: «فاتە خەلکی سلیمانی بوە. ئەو زەمانەی بارەگای بارزانی لیرە بو هاتوە لەو شوینەدا کەتتیکی کردوە. لەوساوە ئەم ناوەیان لەم شوینە ناوە!»

ئەوبەرمان چیای مامە روت و پشتمان چیای درە بی بو. کاتی خوی «شیخ نەبی ماریلیان» لەم خانەقایەدا ئیرشادی کردوە و، گورەکەیشی هەر لەو نزیکانە زیارەتگای ئەهلی

مراز بو. شیخ نەبی زۆری ژن هێناوە. حاجی قادری کۆیی هێرشی زۆری کردوتە سەری و، لە چەندین شیعری دا ناوی هێناوە و هەجوی کردوە.

*

شەوەکەی ئێمە لە بەرگردکە لە مالی شیخ ئەورەحمان بوین. خێزانێکی هەژار بەلام تەبیعەت دەولەمەن بون، کوردپەروەر و تێگەیشتو بون. زۆریکی خۆشیان لە نهۆمی دوەمی خانوەکەیان دا بۆ میوان تەرخان کرد بۆ ئێمە لەوێ دا بوین. پێش ئەوەی دنیا تاریک بێ، هەرچی ڕیبوار و کاروانچییەک ئەگەیشت، ئەیوت هێزێکی زۆری پارتی لە سەر جادەکە کۆبونەتەوە. تا ئەوسا ئێمە نەمانزانی بۆ هێزی پارتی دابەزی بێ. کەوتینە پەیجوری ڕاستی هەوالەکە. دەرکەوت هەوالەکە ڕاست بو.

شەوەکەی بو بە وەیشومەیەکی زۆر بەهێز. ڕەشەبایەکی وا هەلی کرد مالەکەی ئەهەژاند و، بارانێکی بە خوڕوڕەم دایکرد و، هەوا ساردی کرد بو. هەموومان چاوەری بوین ها ئێستا ها تاویکی تر خۆیان بکەن بە ناو گوندا و ببی بە شەری تەنبەتەن، چونکە باوەرمان نەئەکرد لەو چۆلەدا بەرگەی ئەو وەیشومەیە بگرن، بەلام دیارە مرۆڤ هەندی جار لە داروبەرد قایمترە.

*

بۆ ڕۆژی دوایی هەندی لە هێزەکانی هەریمی ٧ ی بالەکم کۆ کردەوە و، لە گوندی «کەلیت»ەوە بە بناری کاروخ دا بۆ سەرگەلی و ئینجا بۆ زارگەلی کیومالیکی وردمان کرد. نە لە دور و نە لە نزیک هیچ نیشانەیەکی هەبونی هێزی پارتی مان هەست پێ نەکرد. هێزەکانیان شەوی پێشو پاشەکشەیان کرد بو بۆ دەوروبەری پشت ئاشان.

لە چەند سەرچاوەی جیاوازەوە هەوالم بۆ هات بو، ئیتر گومانم نەمابو لەوەی بەو نزیکانە هێزەکانی جود پەلامارمان ئەدەن. لە بەر ئەوە ئیتر مانەوەم لە دولی خانەقا بە چاک نەزانی. پێشم باش نەبو بگەڕێمەوە بۆ ناوزەنگ. بە ناو وەرتی دا لە زێنی ئەستێروکانەوە چوم بۆ دولی شاور. لە وەرتی بە دەم ڕێگاوە لە ناکاو بۆ چاکوچونی چوم بۆ سەردانی بارەگای حیزبی شیوعی. زۆر گیر نەبوین ڕۆیشتین. پێشمەرگەکانی لە گەلم بون چاویان هەلئست بو. وتیان لە ژورەکانی کەدا خەلکی تری لێ بو کە نەیانئەویست ئێمە بیانبینین. دوایی دەرکەوت هەندی لە هێزەکانی پارتی بون بە دزییەوە هێنا بویانن پشتمان لێ بگرن. بەلام هێشتا ژمارەیان بایی ئەوە نەبو پەلامارمان بدەن.

*

شەو گەیشتینە پلنگان. چوینە مالی مەلا عوسمان. مەلا عوسمان پیاوێکی کوردپەروەر بو لە کۆنەوە بەشداری جولانەوەی کورد و، دۆستی یەکێتی بو. هێشتا نەحەسابوینەوە هەوالیان بۆ هێنام کە ئەمرو عەبدوللا سور سەری سوارئاغا و هەندی لە فەرماندەی کەرتەکانی هەریمەکەی دابو، پێ ی وت بون کە: «هێزێکی گەورەی جود لەو ڕۆژانەدا دێتە خواری بۆ دەرکردنی یەکێتی لە ناوچەکە، ئەم چونکە خۆی بە خزمیان ئەزانی لە پێشەوە هاتوە پێیان بلی: ئەگەر ئەمان هاوکاریان بکەن ئەوا باشە، ئەگینا ئەمانیش دەرئەکەنا» ترسی ئەوەم هەبو پێش وەخت و، پێش کۆبونەوەی هێزەکانی یەکێتی، دەستپێشخەری هێزەکانی جود بکا بۆ ناوچەکە. لەو کاتەدا هێزێکی ئەوتۆم لە بەر دەس دا نەبو بەری هێرشی جودی پێ بگرم. هێزەکانم نارده چوار دەوری.

*

بەیانی رۆژی ۸/ ی تشرینی یەکەمی ۸۱ هەواڵم بو نارد کە: «یان بیتەوە ریزی یەکیتی، یان بیلایەن لە ماڵی خۆی دابنیشی بەو مەرجەی هاوکاری جود نەکا ئیمەش دەستی لی نەدەین، یان دەسبەجی ناوچەکە چۆڵ بکا» بەڵام ئەویش هەر کە بە هاتنی ئیمەی زانی بو هەر شەوی چو بوە شاخی بیرمکە لە پشتی دولە رەقە، هیزەکانی خوی بە چەند ریزی دامەزراند بو.

*

قادر خەبات دۆستی عەولا سور بو بەیانی زو چو قسەی لە گەڵ بکا. قسەکانی منی پی بلی. تەقەیان لی کرد گوللەیەک لە رانی دا و، لە شوینیکی کراوەدا بە برینداری تا بە لاداخستنی شەرەکە کەوت بو خوینی لە بەر ئەروێشت نەیئەتوانی سەر دەربهینی.

دو لە خزمەکانی عەبدوللا سور، کە فەرماندەی کەرت بون لە هەریمەکەی: حاجی ئاغا حامید و خالصی حەقی ئاغا، هاتنە ناو یەکیتیەوە. هەمان پەیامەکەی بەیانیم بە مانیش دا بۆ نارد. بەڵام پیم وتن ئەم پەیامە تا ئەو کاتە بر ئەکا کە لیمان نەکوژراوە، ئەگەر لیمان بکوژی ئیتر لە کوڵی نابینەوە.

خوم لە گەڵ سوار ئاغا چومە بەرزاییەک بەرامبەر بیرمکە هەمو شاخەکەمان ئەبینی. شوانیک هاتە لای سوار ئاغا راسپاردەی عەولا سوری بۆ هینا بو. بە شوانەم وت: «ئەتوانی نامە یا راسپاردەی منی پی بگەیەنی؟» وتی: «بەلی» وتم: «نامەیەکی بۆ ئەنوسم بۆی بیە!» نامەیەکی کورتم بۆ نوسی هەواڵەکەی بەیانیم تی دا دوبارە کردەوە و بۆم نوسی: «تا شەر و پیکادان نەبوە لە یەک گەیشتن ئاسانە، ئەگەر بو بە شەر و لیمان کوژرا ئەوسا وازی لی ناهینین.» سوار ئاغاش نامەیەکی بۆ نوسی. شوانەکە نامەکانی برد و رویشت. نازانم پی ی گەیاند یا نە. زوری نەخایاند لە بەردەمی دولە رەقە دا بو بە تەقە.

*

محەممەدی برای عەولا سور پیشمەرگە نەبو. تا ئەو کاتەش تیکەڵاوی شەر نەبو. کە تەقە گەرم بو کوژراو و بریندار کەوتن. یەکی لە هێزکی تورکییەکان ئاگاداری کردم: «محەممەد تفەنگی پی بە و، خەریکە بە بیرمکەدا هەڵئەگەری تەقەی لی بکەین؟» وتم: «تەقەی لی مەکەن!» لام وابو براکەی لە تەنگانەدایە ئەچی بۆ یارمەتیدانی. ئەرکی برایەتی بە جی ئەهینی. بەڵام محەممەد ترسابو داخی عەولا سور بەو بریژین، دابویە شاخ خۆی دەرباز بکا نەک یارمەتی براکەی بدا. محەممەد بەشداری شەر نەبو. دوای ئەوە چوە لای حسک لە جیگەی براکەی بو بە فەرماندەی هەریم و، ماوەیەکیش لای هەباسی بایز بو بە جاش.

*

کابرایەکی مەردار لە دولە رەقە بو ناوی حاجی پلنگ بو. ئەوە یەکەم جار بو ناوی وەها ببیستم. ئاژەڵەکەی گل دابوەوە ئەی برد بو بۆ شاخ. لە گەرمەی شەرەکە دا ئەیویست بەرەڵلایان بکا بۆ ئەوەی لە گەڵ بەردانی ئەوان دا بۆ ئاو خواردنەوە، گەمارو دراوەکان خۆیان دەرباز بکەن. ئەمە تاکتیکیکی زیرەکانە بو.

*

دو کەس لە پیشمەرگەکانی ناوچەکە کوژرا بون: یەکیکیان، فەقی مستەفای حاجی

خدری دوڵە ڕەقە، برازای عومەری حاجی برایم بو. کادرێکی جوتیاری هەڵکەوتوی کومەڵە و، ئەندامی کونفرەنسی یەکەم بو، لە ناوچەکەدا زور خوشەویست بو، خوی و مامی و کەسوکارەکانیشی لە شەرە کەدا بون. ئەوی تریان ناوی باپیر بو برازای کوێخا مینەی ئوزرە بو. جگە لەم دوانە پێشمەرگەیەکی گەرمیانیش کوژرا بو، لە بەر خوشەویستی هەر بە ئاموزا بانگیان ئەکرد.

۳ پێشمەرگە کوژرا بون و قادر خەیاتیش بریندار بو. ئاگاداری ئەو هێزەم کرد کە لە دەوری ئەوان دام نا بو، پەلاماری سەرچاوەی ئەو تەقانە بدەن. هەڵمەتێکی کتوپڕیان بو بردن، زوری ئەخاپاند کپیان کرد. هەندێکیان کوژران، یەکێکیان مستەفا کەلیتەیی بو. ئەوانی تریان گیران. سامان کە بە بیرمکەدا هەڵگەرا، بە هوکی توکی ڕێگاکانمان بو دیاری ئەکرد، ئەویش پاشماوەی هێزەکەی دوزیبوەوە، عەولا سوریشیان لە گەڵ بو. ئەوانیش گیران.

کە چومە شوێنی شەرەکە، خزمەکانی فەقێ مستەفا بە ژن و پیاو و منالەوە وروژا بون، چەکدارەکانیان ئەم بەر و ئەوبەری تەنگەکەیان لە پێشمەرگەکانی یەکێتی گرت بو. ژن و منالیش لە گیراوەکان و حەرسەکانیان وروکا بون بە بەرد و تێلا تیبان بەربوبون. ئەیانویست هەمو گیراوەکان بکوژن. چەندی خەرێک بوم خاویان بکەمەوە، کەڵکی نەبو، کەوتنە جنێودان و میل راکێشان لە منیش، خەرێک بو ببی بە شەری خوێبەخو. لەم هەراپەدا عەولا سور کوژرا و ئاژاوەکە کوژایەوە. دیمەنێکی ڕاستەقینەی شەری پشت شکێنی براکوژی. زوری پێشمەرگەکانی هەردولا ئاکو و، خەڵکی هەمان دۆل و هەندێکیان خزمی یەکتری بون.

*

عەولا سور، ڕەنگی سور نەبو، بەڵکو کابرایەکی ڕەشتاڵەی ڕەقەڵە بو، وەکو ئەیانوت: شاخەوانێکی زور وریا و، تفەنگچییەکی دەسراست و، پێشمەرگەیەکی ئازا بو. لە ناخی دڵەوە پێم ناخوش بو بکوژرێ، بەڵام چون بو ڕزگارکردنی ژیانی مروڤێ لە مردن جاری وا هەیە دکتور خوشەویسترین ئەندامی لەشی نەخوشەکە ئەبڕێ، نەخوشەکەیش خوی بە ناچاری ڕازی ئەبێ، یان بو کوژاندنەوەی ئاژاوەی خوێناوی نێوان دو بنەماڵە یەکێ ئەکری بە قوربانی، کوشتنی ئەویش ناچارییەکی لەو بابەتە بو.

بێگومان عەولا سور وەکو هەمو شەهیدەکانی کەی شەری ناوخو قوربانیەکی بێ گوناه بو.

*

## ئاکویەتی

ئاکویەتی بەو ناوچەیە ئەڵێن کە عەشیرەتی ئاکوی تێ دا ئەژی. ئاکو لە لای ڕوژهەڵاتیەوە لە گەڵ مەنگور و، لە لای ڕوژئاوایەوە لە گەڵ خوشناو و، لە لای سەرویەوە لە گەڵ بالەک و، لە لای خوارویەوە لە گەڵ سن، ڕەمەک و پیران (۳ تیرەن لە بلباس)، هاوسنورە. لە ڕوی ئیداریەوە بەستراوە بە قەزاکانی ڕانیە و پشدەرەوە. لە قەزای ڕانیە بەشێکە لە ناحیەی مەرکەز و، لە قەزای پشدەریش بەشێکە لە ناحیەی ناودەشت کە مەرکەزەکەی سەنگسەرە.

لە ڕوی خێڵەکیەوە لە چەند بەش پێک هاتون:

باشناغایی، بنەماڵەی فەرمانڕەوای عەشیرەتەکەن، لە گوندی سەرکەپکانی ڕانیە

دانیشتون.
ناودەشتی، ئەزانن کە لە ناوچەی ناودەشتی پشدەر دا دانیشتون و، لە چەند
تیرەیەک پێک هاتون: شاروشی، کە لە داوێنی قەندیل دا لە ٨ گوندا ئەژیان.
ڕەژیکەری، ئەوانیش ئەبن بە ٣ هۆزەوە: پاوەیی، خەیلە، مەندەمەرە. مەندەمەرە، لە
چەند گوندێک دا: گرتک، دوگزمان، جەلک، مەمک، پیرانە ڕەشە، ماخویزنان.. ئەژیان لە
نێوان چیای زێڕنەکێو و ئاوی کارێزین دا. بەم ناوچەیە ئەڵێن پشدەرە ڕەقە و، بە ئاکۆی ئەم
ناوچەیەشیان ئەوت: ئاکۆ ڕەشکە. ئاوایییەکانیان کەم ئاو و کەم دەرامەتە و ناخۆشە. بە
ئاژەڵداری ئەژیان و بە هاوینان ئەچون بۆ کوێستانەکانی قەندیل. هەباسی بایزی بالو
سەرۆکایەتی ئەکردن. لە سەرەتای دەس پێ کردنەوەی شۆڕشەوە هەباس بوبو بە جاشێکی
دڕ لە ناوچەکەدا.
ئاکۆی بەردەر، ئەوانەن کە لە دولەرەقە، دولی پڵنگان، دولی شاوردا ئەژیان.
بۆلی، لە دەشتی بیتوێن و، بابۆلی، لە بناری کۆسرەت ئەژیان و، بۆ هاوین ئەچون
بۆ حاجی هۆمەران

*
عەشیرەتی ئاکۆ لە سەردەمی شۆڕشەکانی شێخ مەحمودا دوبەش بون: بەشێکیان
لایەنی شێخ مەحمودیان گرتوە و، بەشێکیان لایەنی ئینگلیزیان گرتوە لە دژی شێخ
مەحمود و تورک بون.
هەباسی مامەند ئاغا، کە لە بەر خۆشەویستی پێیان وتوە کاکەباس، پیاوێکی
کوردپەروەر بوە، لە سەردەمی پاشایەتی دا هاوکاری لە گەڵ سەرانی پارتی و حشع کردوە،
دوای گەڕانەوەی مەلا مستەفا بۆ عیراق یەکێ لە لایەنگرە نزیکەکانی بو، لە کۆکردنەوەی
خێڵەکانی ناوچەکە و، هەڵگیرساندنی شۆرشی ئەیلول دا دەورێکی کاریگەری هەبو.
جماعەتی مەکتەبی سیاسی دوای گەڕانەوەیان لە ئێران لە لای ئەم دەس بە سەر دانرا بون
و، بە ئاگاداری ئەم هەڵاتن. لە ساڵەکانی دوایی دا نێوانی لە گەڵ مەلا مستەفا خۆش نەبو.
توشی نەخۆشییەکی سەخت بو، هەتا لێ ی پێس نەکرد، مەلا مستەفا ڕێگەی نەدا بچێ بۆ
تەداوی، کە گەیاندیانە نەخۆشخانە لە بەغداد مرد (١٩٦٦). لە پاش خۆی چەند کوڕێکی
بە جێ هێشت بو: بایز، سوارە، مامەند، هەمزە، کوردە و ئاکۆ.. ئەم برایانە دایکیان و،
عەشیرەتەکانی دایکیان جیاواز بو، لە بەر ئەوە لە ناو خۆیان دا کۆک نەبون.
مەلا مستەفا ڕێزی منداڵەکانی هەباس ئاغای نەئەگرت و، ئەوانیش وەکو باوکیان پێ
نەئەکرا. لە ئاکۆکی مەلایی و جەلالی دا بە لای جەلالی دا داشکان و، بە هۆی ئەوەوە
توشی تاڵانکران و دەربەدەری بون. لە سەرەتای دەس پێ کردنەوەی شۆرشی حوزەیران دا
بایزئاغا بو بە پێشمەرگە و، لە گەڵ ئەو ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ناوچەکە بون بە
پێشمەرگە. لە هێرشەکانی سەرەتای ٧٨ دا کە ناوچەکەیان داگیر کرا و، زۆری خێزانەکانیان
گیران، زۆریان تەسلیم بونەوە. بایز ئاغایش ڕویشتەوە. پاش چەند ڕۆژێ لە ڕوداوێکی
ئوتومۆبیل دا مرد.

*
ناوچەکە، یەکێکە لە ناوچە شاخاویە هەرە عاسییەکانی کوردستانی عیراق.
شاخەکانی زێڕنە کێو، مامەروت، دەرەبی، کاروخ، کورەک، هەندرین، کێوەرەش، ماکوک،

بیـرمکه و، لایەکی گـوندەکـانی دۆلی خـانەقـا بو کـه سـەر بە قـەزای چومـان و، لایەکی گوندەکانی دۆل ئاکۆ و دولی مەلەکان بو کە سەر بە قەزای رەواندز و، لایەکی گوندەکانی دولی شاور و دولە رەقە بو کە سەر بە قەزای رانیە بون.

دوای ئاشبەتال هەندی جادەی قیر و هەندیکی خاکی تی دا کراوەتەوە، بەلام هەر نەیتوانیوە شوینەکانی بە تەواوی بە یەکەوە ببەستی. لە لەشکرکیشیەکانی ٧٧ دا جەیش دەستی بە سەر شوینە گرنگەکان دا گرت بو، «رەبیە» ی تی دا دانا بو. دوای هەلگیرسانی جەنگی عیراق - ئیران زۆری چۆل کرد بو. دانیشتوانی ناوچەکە بە گشتی کوردپەروەر و دۆستی شورش بون و، یەکیتی نفوزی باش و بەهیزی هەبو لە ناویان دا. گەلی پیشمەرگە و فەرماندەی لە ناو خەلکی ناوچەکەدا هەبو، دۆست و لایەنگریشی زۆر بو.

*

ناوچەکە وەکو مەنجەل کەوتوتە نیوان چەند چیایەکی بەرز و بە یەکەوە بەستراوەوە: کیـوەرەش، بیرمکە، کاروخ، مـاکوک و، ناو مـەنجەلەکـەیش چەند دولیکی تی دایە: دولە رەقــە، دولی پلنگان، دولی شـاور و، لـە ناو ئەم دولانەیش دا چەند گـوندیکی تی دا بو: مـیـدیرە، گـویـچکەلان، شـەکـەلە، ناوەزینان، گـولان، کـەرەک، بیـردیی، بەردانگە، نوزە، دیرە..

ناوچەکە شاخاوی و، زەویوزاری کشتوکالیان کەم بو، هەندی باخی هەنار و میوە، هەندی دانەویلە و سەوزە و، بەرهەمی سەرەکیشیان ئاژەلداری و توتن بو. توتنی ئەم ناوچەیە پی ی ئەلین: «توتنی شاور»، وەکو توتنی شوینەکانی تر ناکری بە چەرداخ دا، بەلکو لە شیشی داری ئەدەن و، بۆ وشک بونەوە لـە سەر ئەرز دایئەنین. جۆری توتنەکەیان باش و بۆنداره. بە زوری لە بازاری قاچاخ دا ئەفرۆشری و، تەسلیمی دائیرەی حکومەتی ناکەن.

*

من لە گولان دامـەزرام. گولان: ناوە بو چەند گـوند، بۆ چەند شاخ و، بۆ یەکی لە مـانگەکـانی سـالی کـوردی و، بۆ ئەو شـورشـە «وەهمی» یەی پارتی دوای ئاشـبـەتال هەلی گیرساندۆتەوە.

هەوالەکانی بۆم ئەهات وایان تەگەیاند لەشکرکیشی جود نزیـک بوتەوە. نامـەم بۆ م س نوسی، روداوەکەم بۆ گیـرانەوە و، هەندی بانگەوازم نوسی بو کە بە مـەجفوری لە رادیو بیـخـوینـنەوە داوام لە هیـزەکـانی ناوچەکـە کرد بو کـۆ ببنەوە. داوام لـە مـلازم عـومـەر کـرد هیزیـک بهینیتـە قـەلاتوکـان و، نامەیەکیـشم بۆ سـەید کـەریم نوسی، کە بە بی دواکەوتن خوی و هیزەکەی لە گەلی بو بگەرینەوە دولی شاور.

*

نیـمـە لەم کـەین و بەینەدا بوین بەیانیی روژی ٢٥ ی تشـریـنی دوەمی ٨١ هیـزی هاوبەشی جود پەلامـاری دولی خـانەقـا و وەرتی یان دا. ناوچەکـەیان گـرت. هیـزەکـانیـان گـەیشـتنە زینی ئەسـتـیـروکـان و، لە لای روژهەلاتی سـەری ئەحـمـەدە و، لە لای روژئاوای سەری هەلەموتیان گرت و، رەبیەیان تی دا دامەزراند.

نزیکەی ٥٠ پیشـمـەرگەی یەکیتیمان بە تاک و بە کومـەل چەک کرد بو، لەوانە: حاجی ئەحـمـەدی بۆلی، کە پیاویکی بە سـالاچو و، براگەورەی بولیـەکان بو. چەند سالی لەوەوبەر کوریکی پیشـمـەرگەی کوژرا بو، ئەمجارەش خوی و کورەکەی و چەند خزمیکی

بەر چەک کردن کەوت بون. زۆری ئەم پێشمەرگانە بە ژمارەی کەم لە بارەگا پچوک و بڵاوەکانی ناو وەرتی دا بون. بارەگای حشع یش لە ناو وەرتی دا بو. پێشمەرگەکانی حشع چاوساغی هێزەکانی جودیان کرد بو بۆ سەر بارەگاکانی یەکیتی و، ئەوان داوایان لێ کرد بون لە سەر شەرەفی حیزبی شیوعی چەک دابنێن و تەسلیم بن. مستەفا ناوپردانی خۆی و کەرتەکەی کە لە مامەروت گیریان خوارد بو، لە ئیمە دابرا بون، نائومێد بون بە کۆمەڵ تەسلیمی بەعس بونەوە.

بۆ ئەوەی هێزەکانی جود نەتوانن پێشرەوی زیاتر بکەن، بە هاوکاری کەرتەکانی هەریمی ٧ ی بالەک و ١٤ ی ئاکۆ هەندی سەرشاخ و جێگای گرنگمان قایم کرد، بە هیوای گەیشتنی هێزەکانی یەکیتی، «گۆلان» م کرد بە بنکەی فەرماندەیی.

هەندی وشەی جوگرافی

زین: ئەو رارەوەی کە بە بە بەرزایی دا بە نیوان دو ریزە شاخی بەرزدا تی ئەپەری، وەکو: زینی ماخویزنان، زینی ئەستیروکان، زینی رات، زینی سەران. لە هەندی شوینی تر بۆتە زینو، زینۆ، وەکو: زینوی شیخ، زینوی خەلان. زین، لە زینی ولاخ وەرگیراوە کە لە چەرم دروست ئەکری و، ئەخریتە سەر پشتی ولاخ، لە کاتی سواری دا لە سەری دائەنیشتن (لە پەهلەوی و لە فارسی دا: زین).

چەقەڵ: بەرزاییەکی قوتی بەردەلان، وەکو: چەقەڵی ریگران، چەقەڵی گزرانان. سەیر ئەوەیە لەم ناوچەیەدا «گزران» بە واتای ریگر بە کار ئەهێنن.

ئەستێرۆک: پچوککراوەی: ئەستێر، ئەستێل، واتە حەوزی ئاو کە بۆ کۆکردنەوەی ئاوی کانیەکی پچوک دروست ئەکری.

گەلی، یان گەڵی: ئەو شوینە تەسک و تەنگەبەرەی کەوتوتە نیوان دو چیای گەورەوە، وەکو: سەرگەلی، زارگەلی، گەلی بەدران، گەلی بیجان، گەلی عەلی بەگ. لە هەندی شوین بۆتە گەلۆ، وەکو: سەرگەلۆ، بەرگەلۆ. لە هەندی شوینی تر بە گەرو ماوەتەوە، وەکو: گەروی مەلجەل، گەروی عومەرئاغا، گەروی بیشە، گەروان (گەرووان).

گەلی، گەلو، گەرو: هەرسیک لە یەک ریشەن، لە کوردی دا: گەرو، قورگ، ئەوگ (لە پەهلەوی دا: گەروک. لە فارسی دا: گلو).

ناوی هەندی لە شاخەکانی

کاروخ: زەینەفۆن لە «ئاناباسیس» دا کە باسی گەرانەوەی دەهەزار سەربازی یۆنانی ئەکا بە ناو کوردستان دا ناوی دانیشتوانی ئەوسای کوردستان بە کاردوخ ئەبا. بەلی ی لە نیوان ئەم دو ناوەدا هیچ پیوەندییەک نەبی.

هەلەمەوت: شوینی سەخت و عاسی. یەکیکە لە لوتکەکانی کاروخ. ئەو شوینە عاسیەی حەسەن صەباح کرد بوی بە مەلبەندی خۆی ناوی «ئەلەموت» ، کە هەمان مەعنای هەلەموتی هەیە و، عەرەب بە هەلە کردویانە بە «ئەلەموت».

کۆرەک: کەچەڵ، سەری بی مو.

بۆت (بۆتێ، گۆزە بۆت، کانی بۆت): بەچکە، هەروەها بوتقە، ئەو گلێنەیەی زیر و زیوی تی دا تویتراوەتەوە.

*

رادیوی پارتی ئەم پیشرەوییەی وەکو مژدەی سەرکەوتنیکی گەورە بلاو کردەوە،

رادیۆی یەکیتی یش کەوتە بڵاوکردنەوەی بانگەواز و ئاگاداری بۆ هێزەکانی خۆی. هێزەکانی دەشتی هەولێر، خۆشناوەتی، کۆسرەت کە لە گەڵ سەید کەریم چو بون بۆ «جەمولە» گەیشتنەوە لای من لە گولان. لە گەڵ خۆیان دو کارکەری ئەڵمانیشیان هێنا بو کە تازە گیرا بون.

لەو ماوەیەدا چەند جاری کارکەری ئەڵمانی کە لە عیراق کاریان ئەکرد، گیرا بون. حکومەتی ئەڵمانی کەمال فوئادیان هەڵپێچا بو، ئەویش سەرکردایەتی یەکیتی تەنگاو کرد بو. مامجەلال لە گەڵیان ڕێک کەوت بو کە ئیتر ئەڵمانی نەگیرێن. ئەڵمانیەکان زور ماندو بون، هەندی قسەم لە گەڵ کردن و، وتم پێشمەرگەکان ئێوەیان بە هەڵە هانیوە لە زمانی یەکتری تێ نەگەیشتون، بۆ هەرجێیەک ئەتانەوێ بڕۆن ئازادن. ناردمن بۆ سەرکەپکان دوای پشودان نارد بویاننەوە رانیە.

*

کەوتینە کۆکردنەوەی دەنگوباسی هێزەکانی جود و، ئۆرینی شوێنەکانیان. هێزێکی بێ سەرو بەر و یەک نەگرتو بو. وەکو «مالی فرە ژن و، ئاشی فرە وەستا و، گوندی فرە کوێخا» ئەوانیش «هێزێکی فرە سەرکردە» بون: محەممەدی مەلا قادر فەرماندەی هێزی پارتی و، سەید کاکە فەرماندەی هێزی حسک و، ئەبو عائید فەرماندەی هێزی حشع و، کەریم سەلام فەرماندەی مەفرەزەکەی پاسۆک. کەسیان کاغەزی ئەوی تریانی ئەئەخوێندەوە. شوێنە لاوازەکانمان دۆزیەوە. محەممەدی مەلا قادر، کە لێپرسراوی هێزەکەی پارتی و، وەکو سەرگەورەی هەمو هێزەکانی جود بو، کابرایەکی کوێرەموشەی چاو کتوکوێر بو. ئەیە رۆژ و ئە یەشەو بە باشی بەرپی ی خۆی ئەئەبینی. لە دوای ئاشبەتالەوە ئەوە یەکەم جار بو بگەرێتەوە کوردستان. لە خۆی ڕانئەدی پێشرەوی زیاتر بکا بۆ ناو قولایی کوردستان. ئەترسا ڕیگای گەڕانەوەی ئێرانی لێ ببەستری. هەمویان لە وەرتی دایان کوتا.

*

نەخشەی دەرکردنی جودمان دانا. هەوا ساردی کرد بو. هێزەکانی جود بە شەو هەندی جێگای گرنگیان چول ئەکرد و، بەیانیان زو ئەیانگرتەوە، لەو شوێنە گرنگانە: هەڵمەوت لە چیای کاروخ و سەری ئەحمەدە لە چیای بیرمکە لەم بەر و ئەوبەری زێی ئەستێروکان.

هێزێک لە گەڵ حەسەن کوێستانی و رەحمان سەیدە لە سا و سیوەکەوە بە کاروخ دا هەڵبگەڕێن و شور ببنەوە بو ناو وەرتی و گەلیتە.

هێزێک لە گەڵ شەمال و ئەحمەد مەولود هەڵمەوت بگرن و دابەزن بۆ مەکێ.

هێزێک لە گەڵ سەید کەریم و عەلی نەبی پەلاماری زێی ئەستێرۆکان بدەن.

هێزێکی هەرێمی ١٤ ی ئاکۆ سەری ئەحمەدە بگرن.

ملازم عومەریش کە لە قەلاتوکان بو شەر بە هێزەکانی پشتەوەیان بفرۆشی.

سەرەتای مانگی کانونی یەکەم دەسمان کرد بە جیبەجی کردنی.

حەسەن و هێزەکەی لە کاروخ دابەزین بەرەو وەرتی. حاجی برای حەسەن کوێستانی لە پشتی وەرتی کوژرا.

حاجی یەکێ بو لە پێشمەرگە کۆنەکانی یەکیتی لە ناوچەی گەلالە. گەنجێکی تازە پێگەیشتوی زیرەک و وریا بو. لە پێشمەرگایەتیەوە پێگەیشت بو تا بویو بە فەرماندەی

کەرتی گەلالە لە هەریمی ۷ ی بالەک.
لەو قۆڵەوە تەنگیان بە هیزەکانی جود هەڵچنی بو. سەید کاکەی فەرماندەی ئەو
قوڵە، کە زانی بوی تینیان بۆ هاتوە و، مەترسیبان کەوتوتە سەر، بە پیشمەرگەکانی وت
بو :«بکشینەوە!» یەکیکیان وت بوی: «ئەگەر ئیرە چوڵ بکەین ناوچەکەمان لی ئەگرن.»
وت بوی: «جا با بیگرن ئیرە چی لی یە؟ نە بیرە نەفتی لی یە و، نە مارەیی دایکم لە
سەر داناوە، لەم شاخە نا لە شاخیکی ترا» قسەکەیشی راست بو، ئەمە یەکی بو لە سەرەتا
بنەرەتییەکانی جەنگی پارتیزانی کە بە سەلیقە فیری ببو.
عەلی نەبی گەیشتە زینی ئەستیروکان. تەنیا ریگا لە رانیەوە بە دولی پلنگان دا
بە زینی ئەستیروکان دا ئەچو بۆ سەرگەلو. یەکی لەو فەرماندانەی گەیشت بوە سەر زینی
ئەستیروکان وەکو مژدەی گەیشتنیان بە هوکی توکی بە منی وت: «دەبابەکە گەیشتە سەر
زینی ئەستیروکان» رادیوی پارتی بە درێژ ئەوەندەی باسی هاوکاری یەکیتی و بەعس کرد
بو، شیوعیەکان بە هوکی توکی کە گویان لە وە ببو، دەبابە گەیشتە زینی ئەستیروکان،
باوەریان کرد بو، ئەوەندەی تر ورەیان بەردا بو. یەکیکیان هاواری لی هەستا بە هوکی
توکی وتی: «شەرم ناکەن دەبابەتان هیناوە؟» برادەرەکەی ئیمە لە «دەبابە» مەبەستی عەلی
نەبی بو، کە پیاویکی کەتەی چوارشانە، بەلام لە سەرکەوتنی شاخ دا زور گورج و گوڵ و،
لە هەلمەت دا ئازا و چاونەترس بو. دوای شەریکی کەم جود شکان. هیزەکانی جود کشانەوە
ناو وەرتی. دەوری وەرتی مان دا.
ئیوارەی ۲ ی کانونی یەکەمی ۸۱ بو، ئەمانویست بۆ بەسەربردنی شەو بچینە
وەرتی. بە هوکی توکی ویستمان قسە لە گەڵ لیپرسراویکی حشع بکەین. شەماڵ چەند
جاری بانگی کردن، یەکیکیان وەلامی دایەوە. پیمان وتن: «ریگای سوڵتەمان بە چوڵی بۆ
بە جی هیشتون، هەموتان ئەتوانن لەویوە برون و وەرتی بە جی بهیلن.» لە پیش دا رایان
ئەزانی فیلیان لی ئەکەین، دوایی کە زانییان بە راستمانە هەمو هیزەکانی جود لە ریگای
سوڵتەوە کشانەوە دولی خانەقا و، بەرەو پشتاشان بە ری کەوتن. ئیمەش دابەزین
هەندیکمان بۆ ناو وەرتی و هەندیکمان بۆ دولی خانەقا.

ئوتیلی سیاحی
شیوعیەکان بە دەزگای بیتەل مەکتەبی ئیقلیمیان لە ناوزەنگ ئاگادار کرد بو، کە
وەزعیان خراپە و، داوایان لی کرد بون: هەولی راگرتنی شەر بدەن لە گەڵ یەکیتی. مەلا
ئەحمەدی بانیخیلانی و مامجەلال، پیکەوە بانگەوازیکی هاوبەشیان دەرکرد و، داوایان لە
هیزەکانی هەردولا کرد بو دەستبەجی شەر رابگرن و، هەر لایە لە شوینی خوی دا
هەلویستی دیفاعی وەربگری. هەمان ئیوارە چەند جاری لە رادیوی یەکیتی دا
خویندرایەوە. لە کاتی بیستنی ئەم بانگەوازەدا، شەر بە قازانجی ئیمە بە لادا کەوت بو،
بەلام من هیشتا لە کویستانی مەکۆ بوم لە پشتی وەرتی. دنیا بەفر و هەوا زور سارد بو.
حەمە سەعید کە گوی ی لە بانگەوازەکە بو، وتی: «ئەم کابرایە - مەبەستی مامجەلال بو
- زور سەیرە وا ئەزانی لە ئوتیلی سیاحی دانیشتوین هەر کەس لە ژورەکەی خوی نەیەتە
دەرەوە! ئیمە خەریکە رەق ئەبینەوە»
مەکۆ، کویستانیکی تەخت و بەرین و بەر کراوەیە کەوتوتە بناری کاروخ و
روبەروی قەندیلە. دەیان کانی سارد و سازگاری لی هەڵئەقولی و، سەدان دارگویزی گەورەی

لێ بوو. شوێنێکی خۆش و دڵرفێنە. بۆ گوندی توریستی لە بارە.

*

ئەمجارەش سەید کاکە لە پێش ئەوانی کەدا هەڵات بوو. بە ڕێگاوە بووبوو بەرەو پشتئاشان، هەندێ کاروانچی پێی گەیشت بوو. کاروانچییەکان سەید کاکەیان بە شپرزەیی دی بوو لێیان پرسی بوو: «خاڵە سەید چی قەوماوە؟» وت بووی: «چوزانم مامجەلال وا ئەزانێ حوکمی زاتی لە گیرفانی من دایە، هەرچی مناڵ و تاڵی سلێمانی هەیە ناردوویەتیە سەرم!»

*

دەورووپشتی خۆمان قایم کرد. هێزێکمان نارد بۆ زارگەڵی و هێزێک بۆ دۆڵی خانەقا و، هێزێک بۆ سەران. «قوەتی مەرگە» مان نارد بچێ بۆ سەران کە گەیشت بوونە ئەوێ بیست بوویان هێزێکی جود گەیشتۆتە گەرەوان. هێزەکەی یەکێتی زێرەوی عەبدوڵلا رێوی و، هێزەکەی جود عەریف عەلی فەرماندەیان بوو. عەریف عەلی کە بیست بووی هێزێکی یەکێتی گەیشتۆتە سەران دەسبەجێ کشا بووەوە وای زانی بوو ئەچێ بۆ سەر ئەو. زێرەوش کە زانی بووی هێزێکی جود گەیشتۆتە گەرەوان دەسبەجێ کشا بووەوە وای زانی بوو ئەچێ بۆ سەر ئەو. هەردوکیان وەکو ئەڵێن: «دزاودز کەوت بوون» لە ترسی هێرشی یەکتری کشا بوونەوە بۆ دواوە.

ماوەیەک لە وەرتێ ماینەوە. ڕاگرتنی شەر هیچ جۆرە ڕێککەوتنێکی سیاسی بە دوودا نەهات. بار و دۆخی ژیانی هێزەکانی جود لە پشتئاشان و دەوروبەری زۆر ناخۆش بوو. پشتئاشان هیچ ئاوەدانییەکی تێ دا نەبوو تیا بحەوێنەوە. هێزەکانی پارتی نەیانئەتوانی لە قەندیلەوە بگەرێنەوە بۆ ئێران. شیوعییەکان، ئەیانویست هێزەکانی پارتی لە کۆڵ خۆیان بکەنەوە، بۆ ئەوەی خۆیان ئازادی گەرانەوەیان هەبێ بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی. بەفر ڕێگاکانی قەندیلی بەست بوو. داوایان لێ کردین ڕێگا لە کشانەوەیان نەگرین. ڕێگامان دان. هێزەکانی پارتی لە گەڵەکی باڵەیانەوە بەرەو ڕۆژئاوای ڕێگای هامیلتۆن و، لەوێوە چوونەوە بۆ ئێران. بە ڕۆیشتنی ئەوان گرێیەکی کێشەکە کرایەوە. هێزەکانی حشع، حسک، پاسۆک ئەیانتوانی بە ئازادی بە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی دا هاتوچۆ بکەن.

شەری نێوقلیمگیری ئەمجارەی جود - یەکێتی برایەوە، بەڵام هۆکانی هەڵگیرسانەوەی هەر ما بوون.

*

لە گەڵ هێزەکەی قەڵاتوکان یەکمان گرتەوە. مولازم عومەر و هاوڕێکانی هاتن بۆ لامان لە وەرتێ.

ئەبو عائیدی لێپرسراوی حشع داوای کرد بوو بۆ ڕێکخستنی هەندێ کاروبار یەکتری ببینین. لە سەر جادەی خانەقا لە گەڵ ئەبو عائید یەکتریمان بینی. هەندێ قسە و باسمان کرد دەربارەی شەرەکان. وتی: «وەرتێ، ورطە بوو!» یەکێ لە کارەکانی ئەوە بوو ئەیویست هەندێ لە هێزەکانیان بە ناو هێزەکانی یەکێتی دا بە سەلامەتی بنێرێ بۆ ڕوستێ. هێزەکەیان بە ڕێ کرد و، ئێمەش چی پێویست بوو لە نامە و ڕاسپاردە بۆمان ئامادە کردن.

وەرتێ

گەورەترین گوندی ناوچەکە وەرتێ بوو. بە هۆی تەنگیی دۆڵەکە و، قووڵی ڕووبارەکەوە گوندێکی درێژ بوو، چەند گەرەک: سۆڵتە، بەرزۆ، سول و، پێنج بەرەباب و، پێنج مزگەوتی

تی دا بو.

پیاوەکانی وەرتێ نموونەی کوردی رەسەن بوون. هەمیشە پۆزەوانەیان هەڵکێشا بو، خەنجەرێکیان بە قەدەوە و، تفەنگێکیان بە شانەوە بو، تەنانەت کە ئەچوون بۆ مزگەوتیش بەو جۆرە ئەچوون. یەکێ لە پێشمەرگەکان ئەیوت: «ئەمانە لە کوردی ئەتڵەس ئەچن» مەبەستی لە نیگاری ئەو کوردە بو کە لە سەر پشتی ئەتڵەسی عیراق کرا بو.

یەکێتی لە ناو وەرتێیەکان دا بنکەیەکی جەماوەری فراوانتری هەبو لە چاو حیزبەکانی کەدا. زیاتر لە سەد کەسیان پێشمەرگە بوون. ئەندام و پێشمەرگەی حیزبەکانی تریشی تێ دا بو. هۆی ئەم دابەشبوونە سیاسییە لەم شوێنە شاخاوییە دابڕاوەدا پیروباوەڕی سیاسی نەبو، بەڵکو ناکۆکی شەخسی و ململانێ ی نێوان بنەماڵەکانی بو. لەوەدا رەنگی دابۆوە.

## تەگبیرەکەی مام مۆزرتک

مام مۆزرتک لە لای وەرتێیەکان کەسایەتییەکی زیرەک و زانا و، زۆر بەڕێز بو. بە تەگبیر و رای ژیرانە ناوی دەرکردوە. زۆر نوکتە و قسە و تەگبیر لە زمانی ئەوەوە ئەگێڕنەوە. شانازیی ئەکەن کە پیاوێکی وایان تێ دا هەڵکەوتوە. یەکێ لەو قسانەی ئەیگێڕنەوە ئەم تەگبیرە بوە:

میری سۆران چەند کەسی ئەکاتە سەر دانیشتوانی وەرتێ بۆ مەردوانە و باجی تری لەو بابەتە. پارەکەی داوای ئەکەن زۆر ئەبێ. خەریک ئەبێ مان بگرن لە دانی. پرس بە مام مۆزرتک ئەکەن کە چی بکەن. مام مۆزرتک ئەڵێ: «ئەگەر مان بگرن نێردراوەکانی میر بە شکاتەوە ئەڕۆنەوە، میر هێزێکی گەورە ئەنێرێتە سەرتان باجەکەتان لە سەر زیاد ئەکا و بە زۆریش لێتان ئەسێنێ و ئازارێشتان ئەدا. چاک وایە باجەکە کۆ بکەنەوە و بیاندەنێ و میواندارییەکی شاهانەشیان بۆ بکەن، بەڵام لە رێیشتن دا چەند کەسی بنێرنە سەر رێگایان، رووتیان بکەنەوە و باجەکەیان لێ بسێننەوە و هەموویان بکوژن یەکێکیان نەبێ، ئەویش بە سەر و دەستی شکاوەوە ئیزن بدەن بڕوات هەواڵەکە بباتەوە بۆ میر، بڵێ: وەرتێیەکان زۆریان رێز لێ گرتین، میوانداری چاکیان کردین، باجەکەیشیان کۆ کردەوە و دایانێنی، بەڵام لە رێگای گەڕانەوەدا جەردە هاتە سەرمان رووتیان کردینەوە و ئەوانیان کوشت و منیشیان ئاوا لێ کرد!»

*

لەم شەڕانەدا (هاوین و پایزی ٨١) وەرتێ و، دانیشتوانی ئازاری زۆریان دی بو. چەند کەسی لە گەنجە ئازاکانیان کوژرا بو، چەند کەسێکیان لێ گیرا بو. ئەرکێکی زۆریشمان بە سەریانەوە بو. ویستم دڵیان بدەمەوە. بەر لە گەڕانەوەم نیوەڕۆیەک هەمو پیاو ماقوڵەکانیانم بانگهێشت بۆ نانخواردن، بۆ ئەوەی هەندێ قسەیان بۆ بکەم، ئینجا خوا حافیزییان لێ بکەم.

لە هۆڵی مزگەوت کۆ بوینەوە. هەندێ قسەی گشتیم بۆ کردن. لە ناو بانگراوەکان دا ئیبیان دا بو سەر بە لایەنەکانی تر بوون. نەمویست هەستی کەسیان بریندار بکەم. بە داخەوە باسی شەڕی ناوخۆم کرد و سپاسی هەموویانم کرد کە پەیمانەوە ماندو بوون. ئیتر کەوتینە قسە و باسی ئاسایی. گفتوگۆ لە گەڵ خەڵکی وەرتێ زۆر خۆش بو. یەکێکیان لێ ی پرسیم: «چەند منداڵت هەیە؟»

زور جار ئەم پرسیارەیان لی کردبوم، لە ناو ئەو کومەلاتەدا بە گەنجی ژنیان ئەهینا و، ئەگەر یەکی لە تەمەنی من دا بوایە و هیشتا سەلت بوایە پێیان سەیر بو. ئەبو ناتەواوییەکی هەبوایە، ئەگینا چۆن ئەبی ژن و مندالی نەبی؟

وتم: «هیچ!»

بە سەر سورمانیکەوە وتی: «بۆچی هیچ منالت نیە»

وتم: «چونکە ژنم نەهیناوە»

وتی: «بوچی ژنت نەهیناوە؟»

وتم: «کەسم پی رازی نەبوە»

وتی: «چۆن کەست پی رازی نەبوە؟»

وتم: «ئەوەی من پی ی رازی ئەبم ئەو بە من رازی نابی و، ئەوەیش کە بە من رازی ئەبی، من پی ی رازی نابم.»

کابرا هەر لە سەری رویشت. ئەیویست موجامەلەی من بکا و منیش ئەمویستم ئەم باسە کوتایی پی بهینم وتم: «مام کویخا کچت هەیە؟»

وتی: «بەلی»

وتم: «باشە، کچەکەی خۆتم بدەری!»

وتی: «ئەو سەگە بە کەلکی تۆ نایەت، بۆت ئەدەم بە خوین»

وتم: «بوچی بوم ئەدەی بە خوین، من بە خوی رازیم»

وتی: «کچەکەی من مانگادوشین ئەزانی، تۆ پیاویکی خویندەواری ئەبی ژنیکی خویندەوار بهینی!»

وتم: «ئەوەتا توش پیم رازی نابی!»

زور جار ئەم پرسیارەیان لی ئەکردم، نەمئەزانی چۆنیان وەلام بدەمەوە. بۆ ئەوەی لەم «محاکمە» یە نەجاتم بی، لە بەهاری داهاتودا ژنم هینا.

*

لە گەل ملازم عومەر و عەبدولرەحیم و سامان .. بەری کەوتین بەرەو قوناغی داهاتومان لە قەلاتوکان. شەومان بە قسە و باس لە گەل کویخاکانی مەنگور بە سەر برد. بەیانی بەری کەوتین، ئیوارەیەکی درەنگ گەیشتینەوە ناو زەنگ. برادەران بە بۆنەی سەری سالەوە لە «هۆلی شەهید شەهاب» ئاهەنگیکیان ریک خست بو.

*

# سالی ۱۹۸۲

## شیرکۆ و چلورەفرۆشەکان

بنکەکەمان تاقمێکی تێکەڵی سەیری شاری و لادێیی، گەنج و کاملی خوێندەوار و نەخوێندەوار بو. جگە لەوانەی کە بە دایمی لەوێ بون، زۆرجار پێشمەرگەی خەڵکی سلێمانی ئەهاتن، چەند مانگ یان چەند هەفتە ئەمانەوە، تا چاویان ئەکرایەوە، ئینجا ئەچون بۆ یەکێ لە تیپەکان.

دو لە پێشمەرگەکان: مامە قالە و مام شیرکۆ. هەردوکیان لە ئەرکی رۆژانەی بارەگاکە، وەکو چێشت لێنان، قاپ شتن، نان هێنان، بازار کردن، ئێشکگرتنی شەوانە.. بەخشرا بون. مامە قالە و مام شیرکۆ نمونەی دو کەسایەتی جیاواز و خۆش بون.

شیرکۆ، ناوی مام قادر و خەڵکی گوندی بێموش و ماڵی لە ژاراوە بو. ژن و منالی نەبو. لە شۆڕشی ئەیلول دا لە لقی مامەرزاییەکان پێشمەرگە بو. دوای ۱۱ ی ئازار بوبو بە «حەرەس حدود». لە ئاشبەتال دا گەرابوەوە کوردستان و، لە گەڵ عەلی عەسکەری هات بوە دەرەوە و، هەر لە گەڵ ئەو بو. کاک عەلی کە بە ری کەوت بەرەو برادۆست ٤ کەسی لە پێشمەرگەکانی: مام قادری بێموشی، مام ساڵحی مالومەیی، مام ئەحمەدی سیکانیانی، خالە حەمە.. لە بەر پیری لای ئیمە بە جی هێشت. هەر چواریان «حەقە» و «مامە رەزایی» بون، زۆر بە دلسۆزی دوای کاک عەلی کەوت بون. بە درێژایی ماوەی قەندیل لە گەڵ ئیمە مابونەوە و، هەر چواریان پێکەوە بون. پێشمەرگەکانی تر بۆ خۆشیی ناویان لێ نابون: «العصابە الاربعە». دوای فەوتانی کاک عەلی ئیتر شتێک نەما بو پێکەوەیان کۆ بکاتەوە. خالە حەمە و مام ئەحمەد تەسلیم بونەوە. مام ساڵح چوە لای مامجەلال و مام قادر هاتە لای من. پێشمەرگەکانی لای من هەمو شاری و گەنج بون، ئەمیش بە هاندانی پێشمەرگەکان ناوی خۆی گۆری بە شیرکۆ و، بۆ نازداریش جاروبار پێیان ئەوت: «شێرەدا!».

شیرکۆ هەتا بلێی پاک و خاوێن و، ڕیشی تاشراو و سمێڵێکی قەنجی هەبو. سەر و سمێڵی بۆیە ئەکردەوە بەڵام نەیئەهێشت کەس پێ ی بزانی، دەمیشی تاقمی تێ دا بو، بەڵام کەس نەی دی بو. کە خورما و ڕۆنیان دروست ئەکرد، شیرکۆ نەیئەخوارد ئەیوت: «دانم دێشێنی». هەمیشە خۆی بەست بو و تفەنگەکەی بە شانەوە بو. حەزی لە میوانداری و هاتوچۆی ماڵەکانی شینی ئەکرد. لە گەڵ مامە قالە ناکۆک و، زۆر جار شارییەکان تورەیان ئەکرد. کە سێخورمەی تێوە بژەنرایە یا کتوپڕ تەقەیان لە شتی هەڵپسانایە، ڕانچلەکی و یەکسەر جنێوێکی ئەدا. زۆری حەقەکان وا بون.

کە تورەیان ئەکرد، زۆر جار قسەیەکی بە من ئەوت و، ئەیوت: «بە تەمایە بە چلورەفرۆشەکانی سلێمانی کوردستانم بۆ ڕزگار بکا!» لای وابو گەنجەکانی سلێمانی هەمو چلورە فرۆش بون و، چلورە فرۆشتنیش کارێکی ناشیرینە.

مامە قالەیش، خەڵکی سەنگەسەر بو. لە داربڕین و دار شکاندن دا زۆر شارەزا و بەکار بو، داری هەمو زستانەکەی بارەگاکەی ئیمە ئەم ئەیبڕی و ئەیشکاند. هەرچی ئاژەڵ و

ولاخیکیشمان هەوایە ئەم خەمی جیگا و لەوەری ئەخواردن. هاوینانیش بیستانی تەماتە و سەوزەی بۆ ئەکردین. بەشیکی گرنگی پیویستیەکانی بنکەکەمان ئەم دابینی ئەکرد. شیرکۆ خوی لەم کارانە نەئەگەیاند، لە بەر ئەوە مامە قالە زۆر جار تانەی لی ئەدا و ئەچو بە گۆی دا.

مەسئولی تەور

بەیانییەکیان شازاد لە بەزمیکی سەیر خەبەری بوبوەوە. ئەژدەر، لە سلیمانی زەرەنگەر بوبو، ماوەیەک بو لە پارەگەکەی ئیمە میوان بو. ئەژدەر، بی پرسی مامە قالە، ناشیبانە دەسکاری تەوریکی کرد بو، دەمەکەی کول کرد بو، ئەویش بە توندی پیا هەلشاخا بو. ئەژدەریش پی ی وت بو: «بۆ تورە ئەبی خۆ تۆ مەسئول نیت؟» مامە قالە زیاتر هەلچو بو، تیرو پر جنیوی بە ئەژدەر دابو وت بوی: «چۆن مەسئول نیم من مەسئولی تەورم!»

شازاد ئەیوت دیارە وشەی مەسئول ئەوەندە خۆشە تەنانەت ئەگەر هی تەوریش بی هەر خۆشە و گرنگە.

*

دەوەن بە ئاش

هەندی لەو پیشمەرگانەی بۆ ئیشوکار ئەهاتن بۆ سەرکردایەتی زۆر جار میوانی من ئەبون. جاریکیان غەفور دەرشیشی و نەبی چالاک میوانم بون. هەردوکیان ئەندامی کۆمەلە و، فەرماندەی کەرت بون. ئەویان خەلکی هەورامان و ئەمیان خەلکی بالەکایەتی بو. هەر لەو کۆرەدا: خەجی، ریبەری «تالای رزگاری» و، یا حەلیم، ژنیکی بالەکایەتی، میوانم بون.

غەفور شارەزای بنیشت کردن بو، هەمو سالی خوی و پیشمەرگەکانی کەرتەکەی لە لیرەوارەکانی هەورامان بنیشتیان ئەکرد. زۆرجار خەرجی چەند مانگیکی خۆیان و خیزانەکانیان دەرئەهینا. هەندی پرسیارم لی کرد لە سەر جۆری بنیشت کردن و، کەرستەکانی و، بەرهەمی ئەوسالەیان.

ئینجا لە نەبی م پرسی: «ئەمسال لە هیچ لایەک چون بۆ کەوشان؟» غەفور پیاویکی قسەخۆش و زیرەک، بەلام لە رەوشت و خوی کۆمەلایەتی دا «محافظ» بو، پرسی: «کەوشان چیە؟» نەبی وتی: «لە بەهاران دا کە گول ئەگەشیتەوە و، کوارگ و ریواس و کنگر و.. پەیدا ئەبی، گەنجەکان: کور و کچی گوند یا چەند گوندی، بەیانییان کۆ ئەبنەوە، ئەیکەن بە شایی و رەشبەلەک، دوای ئەوە، بە کۆمەل و بە جوت، بۆ کۆ کردنەوەی گژ و گیا، بە دەشت و چیادا بلاو ئەبنەوە. عەسر بە چارۆکەی پر لە گیا و کوارگ و گولی بۆنخۆش و جوانەوە لە چیا دائەبەزن، دیسان کۆ ئەبنەوە شاییەکی رەشبەلەک ئەکەن و، بلاوەی لی ئەکەن هەر کەس بۆ مالی خوی.»

ئەم سەیرانە بەهاریە نەریتیکی باو و دیرینەی ناوچەی بالەکایەتیە. گۆرانیەکی بە ناوبانگی حەسەن زیرەک لە سەر «کەوشان» ، کە ئەلی:

کیژان دەچنە میرگولان،
بە عام دەچن هەلالان
عارەق لە هەنیەی دەتکی، تەر دەکا وردە خالان

کیژان دەچنە میرگولان،
بە عام دەچن ڕەنوشان
عارەقی سنگ و مەمکی، تەر دەکا پاژنەی کەوشان
نەبی زۆر بە گەرمی و خۆشییەوە باسی ئەکرد. غەفور تورە بو، وتی: «چۆن ڕێگە ئەدەن خوشک و دایکتان شتی وەها بکەن..؟» نەبی چوەوە بە گژی دا، وتی: «خوشک و دایکی تۆیش لەوێ بونایە ئەچونا» خەریک بو دەمیان لە یەک بگیرێ. مشتومڕەکەیان چیرۆکی «دەوەن بە ئاش» ی بیر هێنامەوە.
ئەگێڕنەوە: دو ڕێبوار لە ڕێگا بە یەک ئەگەن. یەکێکیان لە ئاش ئەهاتەوە و دوەمیان ئەچو بۆ ئاش. هەردوکیان باراشیان پێ بو. دوەم لە یەکەم ئەپرسی: «ئاشەکە چوڵ بو یا قەلەبالغ بو؟»
یەکەم ئەڵێ: «زۆر قەرەباڵغە، ئەبێ سەرە بگری، ڕەنگە بە ٣ ڕۆژی تر سەرەت نەگاتێ»
دوەم ئەڵێ: «دەسا مەن لەوێ بومایە سەرەم نەئەگرت و، لە پێش هەموتانەوە باراشەکەم ئەهاڕی»
یەکەم ئەڵێ: «نەتئەتوانی!»
دوەم ئەڵێ: «ئەمتوانی!»
وا ڕێک ئەکەون، دەوەنێک کە لە سەر ڕێگاکەیان دا ئەبێ بکەن بە ئاش و، بزانن کامیان ئەتوانێ نۆرەی بکا و باراشەکەی لە پێش ئەوی کەدا لێ بکا. لە ئەنجامی ئەم مشتومڕەدا باراشەکانیان ئەڕێژن بە سەر دەوەنەکەدا و یەکتریش ئەدەنە بەر خەنجەر.
هەمو ناوچەی بالەکایەتی ڕاگوێزرا بو، جەهش لوتکەی شاخەکانی بە «ڕەبیە» تەنی بو، کێ ئەیتوانی بچێ بۆ «کەوشان»؟ کەچی ئەمان خەریک بون لەم ژورەدا هەمان بەزمی «دەوەن بە ئاش» دوبارە بکەنەوە. بە ناچاری هەردوکیانم بێدەنگ کرد و، باسێکی ترم لە گەڵ دامەزراندن.
غەفور لە سەر «ورەی مرۆڤ» قسەیەکی نەستەقی هەبو: «ئەیوت ئەگەر کێوی شنروی بروخی بە زەلام ئەگیرێتەوە، بەلام ئەگەر زەلام بروخی بە هیچ شتی ناگیرێتەوە!»

*

میتەرولوجی
شێنی بیەکان لایان وابو: هەر هاوینی زەردەزیرە زۆر بێ، ئەوساڵە زستانەکەی سەخت ئەبێ. ساڵی ١٩٨١ هاوینەکەی زەردەزیرە زۆر و، زستانەکەی سەخت بو. بەفرێکی زۆر باری. سەیر ئەوەبو لە گەڵ کرێوەی بەفردا هەورە تریشقە و هەورە گرمەی زۆری لە گەڵ بو. ئەم دیاردە سروشتییەم هەر لەوێ دی بو. ئەو زستانە کەوتمە کۆکردنەوەی هەندێ لەو وشانەی پەیوەندییان بە دۆخی ئاسمان و گۆڕانی کەش و هەواوە هەبو. وشەکان هەمویان ئاشنا و ناسراون، بەلام کۆکردنەوە و لە یەک دانیان وەکو ڕیزە زاراوێکی میتەرولوجی ڕەنگە بێ کەلک نەبێ، بە تایبەتی کورد هێشتا هیچ دەزگایەکی تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوەی لەم بابەتەی نیە.

*

هەوا کە سارد ئەکا، تا ئەندازەی ژێر سفر، ئەرز و ئاو ئەیبەستێ (:ڕچیان،

جەمەدین). تویژی سەرووی ئاوی گۆم و زەلکاو ئەبێ بە سەهۆڵ (:بەستەڵەک، شەختە، جەمەد، یوز) و، ئاوی سەر ئەرز ئەبێ بە زوقم(: خوسار، سپخوار) و، چۆڕاوگە ئەبێ بە چلورە.

هەوا کە گەرم ئەبێ، هەڵم لە ئاو، هالاو (:هۆق) لە ناو کشتوکاڵ و، گڕە و سەهون لە دەشت هەڵئەکا.

ئەگەر هەور ئاسمانی گرت، هەورەکە گەواڵ گەواڵ (:پەڵە پەڵە) ئەوەستێ، یا هەموی دائەگرێ. هەور تیرە و تاریک، چڵکن، سپی ئەبێ.

ئەگەر هەور لە ئاسمان رەوییەوە (:هەڵێ پرونگاند)، بە رۆژ شینایی ئاسمان و، بە شەو ئەستێرەکانی دەرکەوتن، بە رۆژ ساماڵ یا هەساو و، بە شەو سایەقە ئەبێ. شەوی سایەقە لە زستان دا سارد ئەبێ ئەرز و ئاو ئەیبەستێ.

ئەگەر هەور لە ئاسمان دا بەستێ لە شێوەی باران، بەفر، تەرزەدا ئەباری.

باران نم نم، یا بە تاو، یا بە خوڕ، یا بە خوڕەم ئەباری. بارانی بە خوڕ، رەهێڵە، لێزمە، لەنگبزە ئەکا. زۆرجار بروسکە (:هەورە تریشقە، چەخماخە) و، هەورە گرمەی لە گەڵ ئەبێ.

کە باران بباری و، لە هەمان کات دا هەتاو بێ، گورگەزێ بە و، کە ماوەیەک بە خوڕ بباری و خۆش بکاتەوە تاوە، کە سەراسەری وڵات بگرێتەوە ئیقلیمگیرە، کە لە گەڵ بەفر بباریێ شلێوەیە.

لە سەرەتای پایزدا پەڵە ئەدا. پەڵە بارانێکی نەرمە چەند شەو و رۆژ لە سەر یەک خۆش ناکاتەوە تا ئەرز تێرئاو ئەبێ، ئاوی لە سەر رائەوەستێ.

دوای بارانی پەڵە چەن رۆژی هاوینە پچکۆلەیە، هەوا خۆش و دنیا گەرم ئەبێ.

بەفر (:بەرف، بەور) ئەگەر زۆر بباری کرێوە و، ئەگەر کەم بباری پرۆشە ئەکا. بستێک، قولاجێک، ئەژنۆیەک یا گەزێک و زیاتری تێ ئەکا. لە شوێنێکی بەرزەوە کە با بەفر ئەبا بۆ شوێنێکی قوڵتر و پڕی ئەکاتەوە باپێزە. لە لێژایی چیا بەرزەکانەوە هەرەس (:رنو) دێ. لە کوتایی بەهار دا بەفر ئەچێتەوە، کوێستان خاڵ خاڵ ئەبێ.

بەفرەلوکە، بەفرێکی خاوە کلوەکانی بە تەواوی نەیبەستوە زو ئەتوێتەوە.

بەفرخۆرکە، بەفرێکی نەرم و وردە لە کۆتایی بەهاردا بە سەر بەفری زستان دا ئەباری و، ئەیتوێنێتەوە.

تەرزە (: تەزرە، گلێرە، تەگرەگ، تەورگ) بە دەنکی رەقی گەورە یا پچوک ئەباری. گەلا و گوڵ ئەکوتێ.

تەرزەلوکە، نەوەکو تەرزە رەقە و نەوەکو بەفر نەرمە زو ئەتوێتەوە.

بارانی زۆر ئەتوانێ لافاو (:سێلاو، لێخشت، لێشاو، لەهی)ی لێ هەڵبستێ.

لە کۆتایی زستان دا ئەرز تێر ئەبێتەوە، کە باران ئەباری نابێ بە قوڕ و لیتە.

لە کۆتایی بەهار و لە هاوین دا شەو دڵۆپی ئاو لە سەر گژوگیا و گەڵا شەونم (:ئاونگ، خوناو) دروست ئەکا.

لە ناوەراستی تەمووزدا تاوێک باران ئەباری بۆنێکی خۆش لە ئەرز هەڵئەستێ.

بە درێژایی ساڵ و، لە هەموو وەرز و لە هەموو رۆژێک دا با ئەتوانێ بوەزێ (:هەڵ بکا)، بای وەشت بارانی بە دوادا ئەباری، بای دارئاوس لە کۆتایی زستان دا هەڵئەکا و دار

و درەخت گۆپکە و چرۆ ئەکا. بای خەزان کۆتایی پایز هەلئەکا گەلای زەردی درەخت هەلئەوەرینی.
بای شەماڵ لە لای سەرووەوە ئەوزی و، فینک و نەرمە، بارەش یا رەشەبا لە لای خوارووەوە هەلئەکات توندە، لە هاوین دا گەرمە دوای نیوەڕۆیان ئەبی بە گرە و شەرا و، لە زستان دا ساردە ئەبی بە کزە، کە لە گەل بەفر و باران بی، یا لە گەل یەکیکیان بە پی ی توندی و نەرمی ئەبی بە زریان، زەلان، وەیشومە، فەرتەنە، باسریشک، تۆفان.
هەندی رۆژی زستان هەور دائەبەزی، سەر ئەرز ئەبی بە تەم (:تەمومژ، تەمتومان).
هەندی رۆژی هاوین هەور تەپوتۆزی بیابان ئەهینی، ئەبیتە خۆل بارین.
تیکچوونی دۆخی هەوا، ناوچەی گوشاری بەرز و نزم دروست ئەکا، گیژەلوکە لە ئاسمانەوە بەرەو زەمین و گەردەلول لە زەمینەوە بەرەو ئاسمان (:گەرەپیچ، باهوز، باپەلیسک) ی لی پەیدا ئەبی.

*

کورد ناوی مانگەکانی سالی بە گویرەی کەشی ئەو مانگە ناو ناوە: خاکە لیوە. بانە مەر. جۆزەردان. پوشپەر. گەلاویژ. خەرمانان. رەزبەر. خەزەلوەر. سەرماوەز. بەفرانبار. ریبەندان. رەشەمە.
لە هەندی شوینی کە بە مانگی مارت ئەلین: هەرمی پشکوان و، بە نیسان: شەستە و، بە مایس: بەختەباران و، بە حوزەیران: بارانبران و، بە تشرینی یەکەم: گەلاریزان و، بە تشرینی دوەم: سەرپەلە.

*

هەمو ناوچەیەک کۆمەلی لەم زاراوانەیان هەیە، هەندیکیان لە گەل ئەمانەدا هەورادیفن، بەلام هەندیکیان ناوی دیاردەیەکی سروشتە لەوانەیە لە ناوچەکانی ترا نەبی. نوسینەوە و بەکارهینانی ئەم وشانە زمان دەولەمەن ئەکەن.

*

پیشینان وتویانە: «ئەگەر با بی و ئەگەر باران، لە عومری زستان کەم ئەبیتەوە»، هەروەها: «لە زستان شەوی، لە پیران تەوی»، هەروەها: «لە هەمو هەوری باران ناباری». هەروەها: «باران بباری ئاشی ئەگەری، باران نەباری جوتی ئەگەری»، هەروەها: «بەفری بەهاری، تا پوپەی داری، ناگاتە ئیواری»، بۆ یەکی کە تەمی خواردو نەبوبی لە تەجرەبەکانی رابوردو ئەلین: «نە بای دیوە و، نە باران». بۆ مشور خواردنی بی سودی دوای لیقەومان، ئەلین: «لە پاش باران کەپەنک».

*

## هەولی ئاشتبونەوە

دوای ئەو شەرانە هەمومان هەستمان بەوە ئەکرد، کە لەم شەرانەدا هیزو توانای گەلەکەمان دائەچوری. لە زۆر لاوە بە هەمان مەعنا نامەمان بۆ ئەهات بە تایبەتی لە ئەدیب و نوسەر و پیاوە ناسراوەکانی شارەوە. لە ناو خۆمان دا بە دوقولی و سی قولی و، لە چەندین کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی سەرکردایەتی دا باسی چارەسەری ئەم بەلا کوشندەیەمان ئەکرد و، ئەگەراین چارەیەکی بۆ بدۆزینەوە. بریارمان دا هەولیکی زۆر بدەین

بۆ ئەوەی کوتایی پێ بهێنین. یەکەمینیان لە ڕێگای دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە: وتارەکانی ڕادیۆ و بڵاو کراوەکان، زەمینەی بۆ خۆش بکەین. دوەمینیان بکەوینە پەیوەندی ڕاستەوخۆ لە گەڵ هەمو لایەنەکانی پەیوەندیدار.

*

## من و شەڕی ناوخۆ!

ئەوسایش و، هەتا ئێستایش هەندێ لە سەرانی پارتی و حشع و لایەنەکانی تر لە ناو هاوڕێکانم دا من بە یەکێ لە توندڕەوەکان دائەنێن، بەشێکی شەڕی پڕوپاگاندەیان لە دژی من بوە. ڕاستیەکەیشی چەند جارێ من سەرکردایەتی لەشکرکێشییەکانی یەکێتیم کردوە. لێرەدا چەند وتاری دەقاودەق دوبارە ئەنوسمەوە کە لە کاتی خۆی دا دەربارەی شەڕی ناوخۆ، دوای گەڕانەوەم لە شەڕەکان، وەکو سەروتاری کۆمەڵە لە ژمارەکانی کانونی دوەم و شوباتی ١٩٨٢ دا بە ناوی ناوەندەوە نوسیبومە. ڕەنگە خوێندەوار تا ئەندازەیەک لە بیروبۆچونەکانم بگا.

*

## وتاری یەکەم:

## گەلەکۆمەکێ ی چەکدار - سیاسی لە خزمەتی کێ دایە؟

هاوین و پاییزی ساڵی پار، هەندێ شوێنی پارێزگاکانی هەولێر و سلیمانی بون بە مەیدانی زۆرانبازییەکی چەکدار - سیاسی توندوتیژی خویناوی لە بەینی پێشمەرگەکانی ی ن ک و چەکدارەکانی هەندێ حیزبی تردا.

زۆرانبازی چەند مانگی ڕابوردو، درێژە کێشانی ڕوداوە پچڕپچڕەکانی چەند مانگ و بگرە ساڵی پێشوتر بو، بەڵام ئەمجارەیان چەشنێکی بەرینتر، فراوانتر، توندوتیژتر و نەخشە کێشراوی بە خۆیەوە گرت بو، کە خۆی نواند لە گەلەکۆمەکێ ی چەکدار - سیاسی ٤ قۆڵی چەند حیزب و ڕێکخراوی جۆراوجۆری جیاواز لە ڕوی ڕێبازی ئایدیولوجی و سیاسیەوە. وە پێشتریش بە ژاوەژاوێکی پڕوپاگاندەیی خەست و فراوانی ناڕاست، لە بارەی «ڕێککەوتنی نهێنی» ی ن ک لە گەڵ ڕژێمی صەددام بۆ لێدانی «هێزە نیشتمانییەکان» و ڕێگرتن لە «چالاکی شۆڕشگێرانەیان دژی ڕژێم» زەمینەی بۆ خۆش کرا بو.

ڕوداوەکانی ئەم دواییەیش، وەکو هی جارەکانی تر، مایەی پەژارە و جێگەی پرسیاری کۆمەڵانی خەڵک بون، چونکە ڕەوتی بەرەو پێشەوە چونی شۆڕشی کوردستان و ئاقاری خەباتی سیاسی و پێشمەرگەیی لە شا ڕێ ی ئاسایی خۆی لا ئەدا و، لە شەڕی کوردەوە دژی هێزی حکومەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، ئەیگۆڕی بە شەڕی هێزەکانی کورد لە گەڵ یەکتری ڕو بە «کورداندنی شەڕەکە»، بە تایبەتی لە کاتێک دا کە لە ئەنجامی گەرمبونی ئەبەردەکانی جەنگی عێراق - ئێران دا لە بارترین هەلی مێژویی، لە دو دیوی نیشتمانەکەی دا، بۆ بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی گەلی کوردستان - لە سەر ئاستی ستراتیجی بۆ جوڵانی سیاسی، وە بۆ دەسوەشاندنی کاریگەر و کوشندەی هێزە شۆڕشگێرەکان لە دوژمنانی داگیرکەر - لە سەر ئاستی تاکتیکی، هەڵکەوت بو.

*

لە گەڵ کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان دا، ئێمەش لە پەژارەدا بوین، چونکە هەفتە نەبو بە ناڕەوا چەن هاوڵاتیەکی کوردستان لە شەڕی ناوخۆدا، لەوانە چەندین هاوڕێ ی

هەلکەوتو و هەڤالی دلری ئیمە، نەکوژرین..

لە گەل کۆمەلانی خەلکی کوردستان دا، ئیمەش ئەمانپرسی: بۆ؟ ئەم شەرە لە پای چی؟ بۆ سودی کێ؟ قوربانیەکانی ئەم شەرە کێن؟ بۆچی و لە بەر چی.. هەرچەنە هەلومەرجی دەسپێکردنی کاریکی جیددی یا کاتی وەشاندنی گورزێکی کوشندە لە دوژمن نەگات؟ تەقاندنەوەی ناکۆکی لاوەکی و هەلگیرساندنی شەری ناوخۆ و کوردانەنی شەر و خەریک کردنی هێزی پێشمەرگەی ی ن ک کە بە درێژایی شەش سالی رابوردو هەر ئەو هێزی سەرەکی و کاریگەری بە گژا چونەوەی رژیمی عیراق و دەزگا دامرکێنەرەو چەمەنتەمیەکانی بوە لە کوردستان دا، لە دوا شیکردنەوەدا بە قازانجی کێ یە؟

گوایە دنیای کورد ئەوەندە بە خێرایی لە گوران دایە، کە تەرازوی هێزەکانی ناوی و سروشتی سیاسی و چینایەتییان و، بیروباوەر و بۆچون و ریباز و، ئوسلوبی کار.. یان وەها زو بگۆری؟

- ئەوانەی کە ئاشبەتالیان رەفز کرد و بە چەکی شر و توانایەکی کەمەوە رێگەو چیاکانی کوردستانیان گرت و لە ناخۆشترین هەلومەرجی نابەرامبەریی تەرازوی هێزەکانو رژیم و هێزەکانی سەرجەم ئۆپۆزیسیونی عیراق دا، بە توانایەکی کەمەوە، دژی دوژمنیکو بەهیز و دڕ، خەباتی چەکدارانەیان دەس پی کردەوە..

- ئەوانەی ئالای چەسپاندنی گیانی پیکەوەژیانی دیموکراتی بیروباوەر و حیزب و ریکخراوی جیاجیایان هەلکرد، بە جۆرێک کە بۆ گالتە پی کردن، بە بارەگاکانو سەرکردایەتییان ئەگوتن: دژلی ئەحزاب!

- ئەوانەی کە ئالای روخاندنی رژیمی سەددام و دامەزراندنی رژیمیکو دیموکراتییان لە عیراق دا هەلکرد و، نەک جاری بەلکو سەدان جار، بانگی هەمو هێز و حیزبەکانی عیراقیان ئەکرد، کە هێز و توانای خۆیان لە بەرەیەکی یەکگرتودا دژی رژیمو سەددام یەک بخەن و خەباتی چەکدار لە روی سەرکردایەتی کردنی و پیکهاتنی هێزەکانو و مەیدانی چالاکیەوە بکەنە شۆرشی هەمو عیراق..

بەلی ئەوانەی کە بە رەنج و ماندوبونی چەند سال و بە خوینی سەدان شەهیدا راستیی ئەم دروشمانەیان سەلماند و بناغەکەیان دارشت، لە کاتیک دا کە زۆر کەس و زۆ لای تر ئەمەیان بە خەیال و سەرەرویی و پیلانگیران و نۆکەرایەتی ئەم و ئەو لە قەلەم ئەدا..

تۆ بلی ی دنیای کورد ئەوەندە زو بگۆری؟. ئەمانە هەمو بوینە نۆکەری هەمان رژیمو کە لە ماوەی شەش سالی خەباتی پر کویرەوەری و مەینەت و تالی دا، زیاتر لە هەزار هەڤا و هاوری ی بە نارەوا لە شەری نابەرامبەر و، لە ژیر ئازار و ئەشکەنجە و، لە پای قەنارەد کوشتون و، دەیان هەزار کەس لە خوشک و برا و دایک و باوک و خزم و خیزانی ئیمیان کردون و ئازار داون و لە زیندان و گرتوخانە و سەربازگەکان دا توند کردون و، زیاتر ل هەزار گوند و دییان کاول و لە گەل خاک دا یەکسان کردون؟

کورد گوتەنی: سەیرە لە کوێیە!

تۆ بلی ی ئەوانەی لە سەردەمی ئەو تراجیدیە سامناکە ناخۆشەدا خۆیان لە جەنگەو تراجیدیاکەدا زیاون و بەرگەیان گرت و هیچ نەبی ئەوساکە لە کوردستان دا هەر ئەوان بو کە هیزی سەرەکی سیاسی و چەکداری بە گژا چونی رژیم بون، ئیستا بوینە نۆکەری رژیم

پارێزەری سەددام و هێزە داگیرکەرەکانی، وە ئەوانەش کە ئەوسا تەماشاچی و ڕەخنەگر و سەیرکەر و تۆمەت بە پاڵدەر و گیرشێوێن و ڕیز تێکدەر.. بوون، بوونە پارێزەری شۆڕش و قازانجەکانی جەماوەری کوردستان و ڕێبازی شۆڕشگێڕانە؟

لە گەڵ کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان دا، ئێمەش ئەپرسین بۆ؟

ئاخۆ ئەو گەلە کۆمەکی بەی لێیان کردبێ و ئەو شەرەی پەیمان فرۆشتبێن لە سەر ئەوە بو کەوا ئێمە لە بیروباوەری خۆمان هەڵگەڕاوینەتەوە و لە دروشمەکانی خۆمان پەشیمان بوینەتەوە و «ئەمانەوێ چارەنوسی خۆمان ببەستینەوە بە چارەنوسی ڕەشی ڕژێمە خوێنڕێژە ڕزیوەکەی سەددام» و، ئەمانەش گەرەکیان بو بە ڕێگەی گەلەکۆمەکی ی چەکدار - سیاسی، لە مەیدان دەرمان بکەن و بمانکەنەوە بە ناو ڕژێم دا، یان بە زۆر بمانهێننەوە سەر ڕێگای ڕاستی شۆڕش و قازانجی جەماوەرا

*

هەمو زۆرانبازیەکی سیاسی بێگومان زەمینەیەکی مادی هەیە و لە ڕاستی دا نواندنەوەی ململانێ ی چینایەتی بەینی چین و توێژە کۆمەڵایەتیە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵە، کە هەر یەکەیان بە پێ ی دەسکەوت و قازانجی چینایەتی خۆی، لە ڕوانگەی تایبەتی خۆیەوە سەیری ڕوداوەکان ئەکا، هۆکانی دەس نیشان ئەکا، ڕێگەی چارەسەر کردن و ئوسلوبی کار بۆ کردنی دیاری ئەکات.

لە دۆخێکی وەکو ئێستای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا، کە یەکێکە لە ناوچە هەرە گرنگەکانی دنیا، وە یەکێکە لە ناوچە هەرە ئالۆزەکانی دنیا و، شوێنی پەنگ خواردنەوەی چەندین کێشە و گیروگرفت و ناکۆکی قوڵ و گرنگ و کاریگەرە - لە ناو هەر دەولەتێکیان دا، لە بەینی دەولەتانی ناوچەکەدا، لە بەینی گەلانی ناوچەکە و هێز و دەولەتە گەورەکانی دنیادا.. بەمجۆرە ڕوداوەکانی هیچ قوژبنێکی ئەم ناوچە ئالۆزاوە گرنگە، چەن بچوک و چەپەک و پشت گوێ خراویش بێ، ناتوانێ ڕەوتی ئاسایی خۆی بگرێ بە دابڕاوی و دور لە دەستێوەردان و گوشاری ئەم و ئەو، ناکۆکییەکانی ناوی لە ئەنجامی کامڵ بونی هەلومەرجی مێژویی خۆی دا، لە لایەن خودی خاوەن مەسەلەکەوە، لایەلا بکرێ.

جا مەسەلەی نەتەوەی کوردیش، وەکو یەکێک لە گیروگرفتە هەرە ئالۆز و گرنگ و بڕیاردەرەکانی ناوچەکە، دەمێکە سەرنجی بایەخی هێزە کۆنەپەرست و دەولەتە داگیرکەرەکانی کوردستان و دەولەت و هێزە زلەکانی دنیای ڕاکێشاوە و هەر یەکەیان لە لای خۆیەوە، بە جۆرێک، چاوی تێ بڕیوە و هەولی داوە جێ پێ ی خۆی بکاتەوە و پایەی کۆمەڵایەتی لە ناو چین و توێژەکانی کۆمەڵی کورد و نوێنەرە سیاسیەکانی دا بدۆزێتەوە و قورسایی خۆی بخاتە سەری. لە ناو بزوتنەوەی کوردیش دا لە مێژە دو جۆرە بۆچون هەیە بۆ لێکدانەوەی ڕەگی گیروگرفتەکانی گەلی کورد و دۆزینەوەی چارەسەر کردنی، کە لە دو سەرچاوەی ئایدیولوجی جیاواز، بەلکو لە دو جیهانبینی جیاوازەوە دەردێن:

یەکێکیان - لای وایە کە بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کوردستان ئەبێ پشت بە هێزی لە بن نەهاتوی کۆمەڵانی خەڵک ببەستێ و، کۆمەڵانی خەڵک خۆیان خاوەنی مەسەلەکەی خۆیان بن و چارەنوسی خۆیان بڕیار بدەن بە بێ دەستێوەردانی بێگانە، بناغەی ستراتیجی گشتی جولانەوەکەی لە سەر بنچینەی دابین کردنی پێویستیەکانی گۆڕان و گەشە کردنی کۆمەڵایەتی، ئابوری، سیاسی و فەرهەنگی.. کۆمەڵی کوردستان

داپڕێژێ، نەک بە پێ ی قازانجەکانی هێزەکانی دەرەوە و ململانی و زۆرانبازیەکانی بەینی ئەوان.

ئەوی تریان - هەول ئەدا جێگە بۆ جولانەوەی کورد بدۆزێتەوە لە ناو چوارچێوەی ستراتیجی زلهێزەکان و لە ناو کون و کەلەبەری ناکۆکیەکانی بەینی دەولەتەکانی ناوچەکەدا، هەر لە بەر ئەوە پشت بە دەرەوە ئەبەستێ و هەول ئەدا بە هێزی دەرەکی و ناکۆکیەکانی ئەوانەوە ببەستێتەوە، وە بە گوێرەی هەلکەوتنی هەلومەرجی چاک و خراپی «دەولی» مەسەلەی کورد ببزوێنێ و بمرێنێ، وە بیخاتەوە مەیدانی وازیی ناو دەولەتانەوە.

هەولدان بۆ بەستنەوەی مەسەلەی کورد بە ناکۆکیەکانی هێزەکانی دەرەوە جارێک لە گۆشەی راست و جارێکی کە لە گۆشەی چەپەوە، وە خەبات کردن بۆ رێ بڕین لەم پیلانە، خۆی لە خۆی دا زۆرانبازیەکی سیاسیە، ناودانەوەی ململانی ی چینایەتی چین و توێژە کۆمەلایەتیە جیاوازەکانی ناو کۆمەلە، هەریەکەیان لە روانگەی قازانجی چینایەتی خۆیەوە، بەلام بە گوێرەی گۆڕانی هەلومەرجی خاوبونەوە و توندوتیژبونی ناکۆکیەکان، ئەمیش ئەگۆڕێ: چەک دائەنێ یا چەک هەلئەگرێ.

سەر بونی هەندێ هێز لە وەرزی سارد بونی مەناخی ناکۆکیەکانی بەینی عیراق و ئێران دا، پاشان زیندو بونەوە و سەردەرهێنانەوەیان سەرلەنوێ لە وەرزی گەرمبونەوەی مەناخی ناکۆکیەکان دا وێنەیەکی دزێوی بۆچونی دوەمە، لە کاتێک دا کە مەسەلەی کورد لە حالەتی رێکی و نارێکی، ئاشتی و شەر، کۆکی و ناکۆکی دەولەتانی ئێران و عیراق دا، وەکو مەسەلەیەکی بابەتیی میژوکرد هەر هەبوە.

هەلگیرسانی جەنگی عیراق - ئێران هەلومەرجێکی نوێ ی لە سەرانسەری ناوچەکەدا خولقاند، لە لایەکەوە - هەلی بۆ هێزە شۆرشگێرەکان هەلخست کە سود لە شەری ئەم دو دەولەتە داگیرکەرە وەربگرن، بۆ زیادکردنی رادەی چالاکی و جەربەزەی پێشمەرگەیی و بە دەسهێنانی سەرکەوتنی گەورە و کاریگەر لە چوارچێوەی ستراتیجیەکانی خۆیان دا. بەلام لە لایەکی تریشەوە، هەلی بۆ هێزەکانی تریش رەخساند کە سەرلەنوێ بێنەوە مەیدان بۆ بەستنەوەی مەسەلەی کورد بە ناکۆکیەکانی ئەو دو دەولەتەوە.

بەو پێ یە، لە سەر ئەرزی کوردستان ڕیزبونێکی نوێ ی حیزب و هێزە سیاسیەکان هاتەوە گۆڕێ. لایەکیان ئەیویست و هەولی ئەدا سەربەخۆیی رێبازی شۆرشگێرانەی بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانیی گەلی کوردستان، لە گەمە و پیلانی دەولەتەکانی عیراق و ئێران بپارێزێ و لە هەمان کات دا کەلک لە هەلگیرسانی جەنگ وەربگرێ، بۆ زیادکردنی هەرچی زۆرتری چالاکی شۆرشگێرانەی سیاسی و چەکدار و راپەڕاندنی کۆمەلانی خەلک. لایەکەی تریش ئەیویست و هەولی ئەدا کە خەباتی رەوای گەلی کورد لە عیراق دا بکات بە بەشێک لە نەبەردەکانی جەنگی دەولەتی ئێران دژی دەولەتی عیراق و، لە چوارچێوەی ئەو نەخشەیەدا ئەبزوت، کە بەشێکی لەو گەلە کۆمەکی چەکدارە سیاسیە ٤ قۆلیەدا خۆی ئەنواند، کە لە چەند مانگی رابوردودا دژی پێشمەرگەکانی ی ن ک کرا.

*گەلەکۆمەکی کەی ئەمجارە، ئەگەرچی لەو دیو سنورەوە، بە توانایەکی زۆرەوە نەخشەی بۆ کێشرا بو، وەکو هەمو جارەکانی تر ئەمیش لە بەرامبەر باوەری پتەو و خۆراگریی دلێرانەی پێشمەرگەکانی ی ن ک دا شکا و سەری نەگرت. بەلام هەر وەکو

هێرشەکەی ئەمجارە، لە هەمو ئەوانی پێشو، بەربلاوتر و توندتر و ڕێکخراوتر بو، هەروەها شکاندنەکەشی بە هەمان ئەندازە گەورە بو، بگرە لە قەوارەی هێرشەکەش زلتر بو، چونکە سەرلەنوێ چەند ڕاستیەکی بە زەقی ساخ کردەوە، لەوانە:

- دەرکەوت کە پێشمەرگەکانی ی ن ک لە ماوەی چەن ساڵی ڕابوردودا، لە سەختترین هەلومەرجی خەبات دا، چۆن بەرگەی هێرش و پەلاماری دڕندانەی هێزی داگیرکەری ڕژێمی فاشیستی عیراقیان گرتوە و، چونکە لە ناو باوەشی کۆمەلانی خەلک و لە گەل ئێش و ئازارەکانی ئەوان دا ژیاون، لە گەشە کردنێکی چونایەتی و چەندایەتی شێنەیی و بەردەوام دا بون، لە بۆتەی خەباتی شۆرشگێرانەی خوێناوی و سەخت و دژواردا قال و پەروەردە بون، بۆیە بە هیچ هێزێکی خۆماڵی و خۆولاتیش لە شکاندن و بەزاندن نایەن و بە ئاسانی لە مەیدان دەرناکرێن، بگرە هەروەکو چۆن بە درێژایی ساڵانی پێشو، هێزی سەرەکی و کارێگەری بەربەرەکانی ی ڕژێم بون لە کوردستان دا، هەر بەو جۆرە پارێزگاری هەمان ئاستی بلند و شوێنی بەرز و سەربەرزانەی خۆیان کرد چ لە بەرامبەر هێرشەکانی ڕژێم دا و، چ لە بەرامبەر پەلاماری نارەوای هێزی چەکداری حیزبەکانی تردا.

- دەرکەوت هەر ئەو سیاسەتە سەرئەکەوێت و لە وێژدانی خەلک دا جێگیر ئەبێت و سەرنج و بڕوای خەلک بە دەس ئەهێنی، کە لە سەر بناغەی ڕاستی و ڕوداو بنیات نراوە، نەک ئەوەی لە سەر بناغەی پیلانگێران و پروپاگاندەی ناڕاست و ژاوەژاوی دروستکراو و هاشە و هوشەی درۆ و هەلگێرانەوەی ڕوداوەکان و چەواشە کردنی گەل و تەفرەدانی خەلک و فێل و تەلەکەبازی.

ئەوانەی پەنایان بردە بەر شەری پروپاگاندەی درۆ، زۆری نەخایاند، درۆکانیان ئاشکرا بو، بوختانەکانیان دەرکەوت، دەستەکەیان کەوتە ڕو.. خۆیانی پێ سوک و ڕیسواتر بون.

- دەرکەوت کێ لە خزمەتی پلانەکانی داگیرکەرانی کوردستان دایە و بە کردەوە، بە نهێنی و بە ئاشکرا، نەخشەکانی ئەوان جێبەجێ ئەکات، لە پەنای ئەودا و بە بەرماوەی ئەوان ئەژی و بە پێ ی قازانج و دەسکەوتەکانی ئەوان ئەجولێتەوە و، بە فەرمانی ئەوان پێشرەوی و پاشەکشە ئەکا، سەر دەرئەهێنی و سەر ئەباتەوە کون. ئەگینا ئەوی بیەوی شەری ڕژێمی عیراق بکات، ئەگەر لە بیانو نەبێ، مەیدانێکی بەرین و فراوانی ئەبەردی چەکدار و چالاکیی سیاسی لە بەردەم دایە، سەدان سەربازگەی گەورە و بچوک و ڕەبیەی هێزی داگیرکەری دوژمنی لە بەر چاو و لولەی تفەنگ دایە و ڕێگەی لێدانی هێزەکانی ڕژێمیش هەر بە سەر سنگی پێشمەرگەکانی ی ن ک دا تێ ناپەڕی.

- دەرکەوت کێ لە هەمو لایەک زیاتر بە تەنگ بەجێهێنانی فرمانی نیشتمانی و لێپرسینەوەی مێژویی و جێبەجێ کردنی خواست و داواکانی جەماوەرەوەیە و سورە لە سەر شکاندنی پیلانی «کورداندنی شەر» و نەهێشتنی شەری ناوخۆ و، تەرخان کردنی هەمو وزە و تواناکان بۆ شەری ڕژێمی عیراق. ڕوداوەکان ئیسپاتیان کرد، کە لەم ڕوانگەیەوە ی ن ک هەر وەکو سەر بۆ «زۆری چەک» و گوشار و گەلەکۆمەکی دانانەوێنی، بەلام ئەگەر ئازادی هەلبژاردنی شێوەی لایەلا کردنی گیروگرفتەکان بە ڕێگای سیاسی یا چەکدار، بەند بێ بە دەسەلات و ئارەزوی یەکێتیی نیشتمانیەوە، ئەوا ی ن ک مەگەر هیچ ڕێگایەکی تری خۆپاراستنی لە بەردەم دا نەمێنی، جگە لە بە کار هێنانی چەک، ئەگینا هەمیشە ڕێگەی گفتوگۆی هێمن و دیموکراتی ئەگری و، ڕێگەی سیاسی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان

هەڵنەبژێری.

*

ڕووداوەکان کۆن ئەبوون و لە بیر نەچوونەتەوە، هۆکانی تەقینەوەی وەزعەکە هەر ماون، گیروگرفتەکان بە چارە نەکراوی هەڵپەسێردراون. کەواتە مەترسی هەڵگیرسانەوەی شەڕی ناوخۆ هێشتا لە گۆڕێ یە، بەڵام هێشتا هەلی بە لادا خستنی هێمنانە و سیاسی گیروگرفتەکان، لە هەلی لایەلا کردنی چەکدارانەیان، زۆرترە.

هێشتا لە قوڵی ی ن ک وە دەرگای چارسەرکردنی سیاسی مەسەلەکان بە کراوەیی، لە سەر گازی پشتە. (کۆمەڵە، کانوونی دووەمی ١٩٨٢)

*

وتاری دووەم:

شەڕی ناوخۆ یا شەڕی ڕزگاری نیشتمان؟

گەشەکردنی بزووتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی گەلی کورد لە کوردستانی عیراق دا دوابەدوای شۆرشی ١٤ ی تەمموزی ١٩٥٨، پاشان دەسپێکردنی خەباتی چەکدار و هەڵگیرسانی شۆرشی ئەیلول و وراگرتنی چەن ساڵەی، کارێکی وەهای کرد کە کوردستانی عیراق ببێتە مەڵبەندێکی گرنگی بزووتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کورد لە سەرانسەری کوردستان دا. بگرە ببێتە ناوەندێکی ئەوتۆ کە تێکرای تێکۆشەرانی کورد لە پارچە جیا جیاکانی کوردستان دا چاوی هیوای تی بڕن و پشتی پی ببەستن و پشتیوانی لی بکەن، خەباتی خۆیان و تێکۆشانی حیزب و ڕێکخراوەکانی خۆیانی پێوە گری بدەن، بەڵکو بیخەنە ژێر چەتری ڕابەریی سیاسی و ئایدیۆلۆجی و ڕێکخراوەیی.. سەرکردایەتیەکەیەوە.

بارزانی کە سەرکردایەتی شۆڕش و پارتی لە ژێر دەس دا بو، هەروەها جولانەوەی کوردیش لە سەرانسەری کوردستان دا کەوت بوە ژێر نفوز و دەسەڵاتی ئەوەوە ئەیتوانی دەوری سەلبی یا ئیجابی وازی بکا هەم لە جولانەوەی کورد لەو پارچانەدا و هەم لە ناو حیزب و ڕێکخراوەکانیان دا، بە تایبەتی لەو قۆناغەدا، کە سەرەڕای پەرەسەندن و بەهێز بونی شۆرشەکە خۆی، لە ناو ڕۆشنبیران و تێکۆشەرانی کوردیش دا ئەو باوەڕە زاڵ بو: ئەگەر لە پارچەیەکی کوردستان دا شۆرش هەڵگیرسا تا بە ئەنجام ئەگات، ئەبی هەمو پارچەکانی تر لە خزمەتی ئەو شۆرشەدا بن و لە سنوری دەسکەوت و قازانجەکانی ئەودا بجولێنەوە.

ئەم باوەڕە ئەگەر لە چوارچێوەی ستراتیجێکی گشتی دا دابڕێژرایە و پەیڕەوی بکرایە و کاری پی بکرایە، لەوانە بو ئەنجامی کاریگەر و گەورەی هەبوایە، بەڵام بە شێوەیەکی خراپ لە لایەن سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلولەوە، بە تایبەتی لە لایەن بارزانیەوە، بە کار هێنرا، هەم بۆ کوێخایەتیەکی ناڕاستی پارچەکانی تری کوردستان لە ڕوی سست کردنی جولانەوەکانیان و خۆ هەڵقورتاندن لە کاروباری ناوەکی حیزب و سەرکردایەتیەکانیان و تەرخان کردنیان بۆ خزمەتی جولانەوەی کوردستانی عیراق.. وە هەم بۆ پاساودانی دەستێکەڵاوکردن لە گەڵ دەولەتە داگیرکەرەکانی کوردستان. ئەوەش لە ڕەفتاری هەردو باڵەکەی پ د ک دا دەرکەوت و بە کردەوە سەلما.

هەرەس هێنانی کتوپڕ و خێرای شۆرشی ئەیلول لە کوردستانی عیراق دا لە ئەنجامی ڕێککەوتنی شا - صەددام ساڵی ١٩٧٥ لە جەزائیر دۆخێکی نوی ی لە ناوچەکەدا

خولقاند. ئەو ناوەندەی لە کوردستانی عێراق دا بۆ جولانەوەی کورد لە سەرانسەری کوردستان دا دروست بوبو هەرەسی هێنا. هەروەکو گەلی کوردی عێراق کەوتە گێژاوی مەینەتییەکی نەتەوایەتی دژوارەوە، هەروەها هەمو نەتەوەی کوردیش، لە ئەنجامی ئەوەدا، ڕەنجەڕۆ و دردۆنگ و بەدبین بو لە هەر ناوەندێکی تر لە بزوتنەوەی کوردا.

هەرچەندە خامۆشییەکی ترسناک، لە دوای ئاشبەتال، باڵی بە سەر کوردستان دا کێشا بو بەڵام زۆری نەخایاند، جوڵە و بزوتن کەوتەوە سەرانسەری نیشتمانەکەمان.

- لە کوردستانی عێراق، واتە لە کەلاوەی ئاشبەتال دا، خەباتی ژێرزەمینی دەستی پێ کردەوە و هەر زۆر زو چوەوە قۆناغی خەباتی سیاسی - چەکدار.

- لە کوردستانی تورکیا بزوتنەوەیەکی سیاسی - جەماوەریی پەرەی سەند.

- لە کوردستانی ئێرانیش جمووجوڵی ڕێکخراو سەری هەڵدایەوە و لە گەڵ ڕوخانی شا بوە بزوتنەوەیەکی سیاسی - جەماوەریی فراوان و قوڵ و، زۆرێشی پێ نەچو بوە جولانەوەیەکی سیاسی - چەکدار.

ئەگەر پێشتر کوردستانی عێراق بوبوە ناوەندی بزوتنەوەی کورد و بەشی زۆری حیزب و ڕێکخراوەکانی سەرانسەری کوردستان خۆیان پێوە ئەبەست یا لێ ی نزیک ئەکەوتنەوە و پەیڕەوی ئامۆژگاری و ڕێنوێنییەکانیان ئەکرد، لە گەڵ تێکچونی شۆرشی کوردستانی عێراق دا ئیتر نەک هەر ئەو ناوەندە تێکچو بو، بەڵکو ئەو تەجروبەیەش لە بەر چاوی زۆربەی حیزب و ڕێکخراوەکانی کوردستان دا شکا بو، ئیتر لە بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کوردا ناوەندێک نەما بو لە ڕوی توانای سیاسی - تیۆری یان لە ڕوی توانای چەکدار - ماددییەوە ئەو هێز و نفوز و دەسەلاتەی هەبی، حیزب و ڕێکخراو و تێکۆشەرانی کوردستان پورەی لێ بدەن و لێ ی کۆ ببنەوە. ئەگەر پێشتر کوردستانی عێراق ببوە نمونەیەکی دیاری کۆکردنەوەی جەماوەری خەڵک لە تاقە حیزبێک دا و سیستەمی تاقە پارتی بە سەر خەڵکی دا سەپا بو، ئەم تەجروبەیەش لە گەڵ ئاشبەتالی سەرکردایەتی و داوودەزگاکانی پ د ک و تێکچونی شۆرشە چەکدارەکەی کوردستانی عێراق، شکا و باوی نەما.

بەمجۆرە لە هەر پارچەیەکی کوردستان دا چەن حیزب و ڕێکخراو دەستیان کرد بە کارکردن و لە سەرانسەری کوردستان دا چەندین حیزب پەیدا بون. هی نوێ هاتنە مەیدانەوە و کۆنەکانیش بە خۆ کەوتنەوە.

دەرکەوتنی چەندین حیزب و ڕێکخراوی جۆراوجۆر، لە لایەکەوە ئەنجامی ئاسایی گۆڕان و گەشە کردنی کۆمەڵایەتی، ئابوری، سیاسی.. کۆمەڵی فرە چینی کوردستان و نیشانەی دەرکەوتنی سنوری چینایەتی بو لە بەینی چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکان و تواندنەوەیان لە ڕێکخراوی سیاسی جۆراوجۆردا. لە لایەکی ترەوە دەرکەوتنی ئەم هەمو حیزب و ڕێکخراو و دەستە و تاقمانە.. کە هەندێکی شوێنی چینایەتی خۆی پێ نەدۆزرا بوەوە، یا لەم لا و ئەو لاوە فویان پێ دا ئەکرا، نیشانەی ئاڵۆزیی و پەراگەندەیی سیاسی و پەرت بون و بە فیڕۆ چونی وزە و هێزی کۆمەڵانی خەڵک بو، بگرە سەرەتای سەرهەڵدانی تەنگوچەڵمەیەکی قوڵ و ئاڵۆز بو لە بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کوردا، بە تایبەتی چونکە هەندێکیان بەرەو خۆ چەکدارکردنێکی لاسایی کەرانەوەی بێ بەرنامە ئەچون.

* لەبەرئەوەی لە هیچ کام لەو دەوڵەت و وڵاتانەی کورد و کوردستانیان بە سەردا بەش کراوە ماوەی ژیانی دیموکراتی و خەباتی سیاسی هێمنانە نەبوە، لەوەتەی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کورد، بە پێ ی تێگەیشتنی نوێ، پەیدا بوە، هەمیشە شێوەیەکی سەرەکی خەباتی چ بۆ مان و خۆپاراستنی وە چ بۆ دەربڕینی بیروڕا و داواکردن و سەندنی مافەکانی، بە ناچاری ڕێگەی خەباتی چەکدار و، هەڵپەی خۆ چەکدار کردن و بە کار هێنانی چەک بوە. هەر بۆیە زۆربەی حیزب و ڕێکخراوەکانی کوردستان هەوڵی پێکهێنانی هێزی چەکداریان داوە. جا لە بەر ئەوەی ئەمانەش لە پەیڕەوی کردنی ڕێوشوێنی پێکەوەژیانی دیموکراتییانە و لە نەریتی پێکەوە هەڵکردنی سیاسی دا کەم تەجروبە بون و، هەمیشە داگیرکەران و ئیمپریالیزمیش لوتیان ژەندۆتە مەسەلەی کوردەوە، بۆیە زۆرجار ناتەبایی و نارێکییەکانی بەینی ئەو هێز و تاقمانە، لە کاتێک دا کە ئەبێ بە ڕێگەی سیاسی لایەلا بکرێن، ئەتەقیتەوە و ئەگاتە پلەی پێکادانی چەکدار و شەڕی خوێناوی، بە جۆرێکی ئەوتۆ کە لە هەندی قۆناغ و لە هەندی کات و شوێن دا بزوتنەوەی کوردی توشی مەترسییەکی زل ئەکا، چونکە خەباتی هێزە کوردیەکانی لە شاری ی ئاسایی خۆی، واتە لە خەبات دژی داگیرکەران و ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانیان، لا ئەدا و ناکۆکی نێوان هێزە کوردیەکان ئەتەقیتەوە و ئەوەندە توند ئەبێ بە جۆرێک لە باتی ئەوەی شەڕی قورس و خوێناوی بکەوێتە مەیدانی هێزەکانی کورد و داگیرکەرانەوە، کەوتۆتە ناو ڕیزەکانی کورد خۆیەوە.

لە بە سەر کردنەوەی شریتی ڕوداوەکانی ماوەی چوار - پێنج ساڵی ڕابوردوی نیشتمانەکەمان دا ئەبینین:

- لە کوردستانی تورکیا ئەگەرچی شۆڕشی چەکدار و لەشکری چەکداری تیا نەبوە و حیزب و ڕێکخراوەکانی ئەوێ لە خەباتی ژێرزەمینیی دا بون، کەچی لە گەڵ ئەوەش دا ناکۆکی ئایدیولوجی و سیاسی لە بەینی هەندی حیزب و ڕێکخراوی ئەوێ دا تەقییەوە و کەوتنە کوشتن و تۆقاندنی کادر و ئەندام و دۆستی یەکتری، تا کودەتای سپایی و سەپاندنی حوکمی عورفی جێگەی بە هەمویان لێژ کرد و جموجوڵ و چالاکیی کەم کردنەوە و سەرکردە و کادر و ئەندام و لایەنگرەکانی گرتن و ڕاونان و دەربەدەر کردن.

- لە کوردستانی ئێران دا ئەگەرچی لە پاش ڕوخانی شا جەوێکی ئازاد و دیموکراتی کەم وێنەی خەباتی سیاسی و ململانێ ی ئایدیولوجی خوڵقا بو، بەڵام لە گەڵ ئەستور بونی باسکی چەکداری ڕێکخراوی ئەوێ و لە گەڵ قوڵ بونەوەی ناکۆکییەکانی بەینیان، لەوێش هەندی لە گیروگرفتەکانیان، کە ئەکرا بە ڕێگەی سیاسی چارەسەر بکرێن، جاروبار ئەتەقییەوە و ئەگەیشتە پلەی پێکا هەڵپژانی چەکدار و خوێناوی.

هێشتا ئەم گیروگرفتانەی ناو خۆیان بە لایەک دا نەکەوت بو، هەمو هێزەکانی شۆڕشی کوردستانی ئێران کەوتنە بەر پەلاماری چەکداری هێزێکی تر کە گوایە یەکێکە لە هێزەکانی کوردستانی عێراق.

- لە کوردستانی سوریاش ململانێ ی ڕێکخراوەیی و سیاسی لە بەینی حیزبەکان دا، هەندی جار ئەوەندە توندوتیژ و قوڵ ئەبێ تا ڕادەی لە یەک دابڕان و بە گژ یەکا چونێکی وەها کە ئەگەر لەوێش خەباتی چەکدار لە گۆڕێ بوایە لەوانە بو ئەوێش بگاتە ڕادەی شەڕی خوێناوی و چەکدار لە بەینیان دا.

- له کوردستانی عیراقیش ئەوە چەند ساڵە شەری ناوخۆ بۆتە یەکێک لە گەورەترین کۆسپەکانی ریگەی بۆ پیشەوە چونی جولانەوەکە. لیکدانەوەیەکی بابەتیی رەوتی رووداوەکان و نزیکبکی گشت لایەنی دەری ئەخەن شەری ناوخۆی بەینی هیزە کوردییەکان و خەریک بونیان بە یەکترییەوە لە سەرانسەری کوردستان دا دیاردەیەکی گشتییە، ئەگەرچی لە کوردستانی عیراق و لە کوردستانی ئیران دا لە چاو پارچەکانی تردا گەرمتر و خویناویترە. لە راستی دا توژینەوەی هۆ راستەقینەکانی شەری ناوخۆ دەری ئەخا کە جگە لە کەم تەجروبەیی ئەم حیزب و ریکخراوانە لە مەیدانی پیکەوە ژیانی دیموکراتییانە و، جگە لە تاودانەوەی ململانی ی بیرورای جیاواز و قازانج و دەسکەوتی چینایەتی جۆراوجۆر، قوڵکردنەوەی ئەم دیاردەیە و نانەوەی شەری ناوخۆ بە هیچ جۆر دوور نیە لە فیتی داگیرکەرانی نیشتمانەکەمان و ئیمپریالیزمی جیهانیی و نۆکەرەکانیان، وە لە نەخشە و پیلانەکانی ئەوان بۆ لادانی بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانیی گەلی کوردستان لە شا ری ی میژوویی خۆی واتە: شەری داگیرکەران و ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانیان، بەرەو شەری ناوخۆی هیزە کوردیەکان لە گەڵ یەکتری واتە «کورداندنی شەرەکە» لە کاتیک دا کە هیشتا گەلی کورد لە قۆناغی شەری رزگاری نیشتمان دایە نەک لە قۆناغی شەری ناوخۆی چینە جیاوازەکانی.

لە قۆناغی ئیستای خەباتی رزگاریخوازانەی گەلەکەمان دا، شەری ناوخۆ، لە دوو دیوی کوردستان دا، لە دیوی عیراق و لە دیوی ئیران، خەتەریکی گەورەی دروست کردوە بۆ سەر بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانیی گەلی کورد، بەشیکی گەورەی رەنج و فیداکاری هیزە کوردییەکان لە شەری یەکتری دا بە فیرۆ ئەچی، هیزە کوردییەکان بە شەری سیاسی و چەکدار و ئیعلامی یەکترییەوە خەریک ئەکا و ناتوانن بە چاکی خەریکی دوژمنەکانی گەلەکەمان بن و گورزی کوشندەی تی بسرەوینن، کۆسپ و تەگەرەی زل لە بەردەمی رەوتی بزوتنەوەی رزگاریخوازانەی کوردا دروست ئەبی و ناتوانی تەکانی بە تین و بە گور بەرەو پەیدەبهینانی ئامانجەکانی بدا، دلی کۆمەلانی خەلک لە تیکۆشان سارد ئەبیتەوە..

بۆیە ئەبی لە روانگەیەکی زانستییەوە، سەیری هەلومەرجی نوی ی کوردستان بکەین، ناکۆکییەکانی ئەم قۆناغە هەلبسەنگینین، سروشتەکانیان، ریگەی چارەسەر کردن و شیوەی لایەلا کردنیان دیاری بکەین، فرمانەکانی خۆمان، لەم قۆناغە گرنگەی خەباتی گەلەکەمان دا دیاری بکەین.

ئەبی زۆر بە وریایی و ژیری، زۆر بە هوشیاری و بەرۆشەوە، بە دلسۆزی و تین و تاوی شۆرشگیرانەوە، بە لە خۆبرانیکی تەواو و هەست کردنیکی قوڵەوە بە لیپرسنەوەی میژوویی، لە پلەی ئیستادا هەوڵ بدەین:

لە لایەکەوە - لە رووی سیاسی، ئایدیولوجی، پیشمەرگەیی.. وە خۆمان تەیار و ئامادە بکەین بۆ پەکخستنی هەر پیلانیکی دوژمنانە و بۆ بەرەنگاریی هەر رووداویکی نالەبار و نەویستراو و بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر پەلامار و هیرشیکی ئەکریتە سەرمان.

وە لە لایەکی تریشەوە - بەوپەری تواناوە هەوڵ بدەین کە چارەیەکی سیاسی بۆ شەری ناوخۆ لە کوردستان دا بدۆزرێتەوە کە بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانی گەلی کورد لە بەلای شەری لاوەکی لا بدا و تەحیلی لە شا ری ی میژوویی خۆی، شا ری ی خەبات و شەر کردن دژی داگیرکەران و ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانیان لا بدا و بخریتە سەر لاری ی شەری

هیزه کوردییه‌کان له گه‌ڵ یه‌کتری. (کۆمه‌ڵه، شوباتی ١٩٨٢)

*

وتاری سییه‌م:

کوردستان؟
(مساومه) له گه‌ڵ داگیرکه‌ران یا له گه‌ڵ هیزه ناکۆک و جیاوازه‌کانی کوردستانی داگیر
عیراق و ئیران وه‌کو دو ده‌وڵه‌ت که هه‌ر یه‌کیکیان پارچه‌یه‌کی کوردستانی داگیر
کردوه و به‌شیکی نه‌ته‌وه‌ی کورد ئه‌چه‌وسینیته‌وه، له‌وه‌تی دامه‌زراون، سه‌ره‌ڕای ئه‌و ناته‌بایی
و ناریکییه‌ی به درێژایی میژو له سه‌ر سنور و مه‌زهه‌ب و ڕه‌گه‌ز و، له سه‌ر کاروباری
سیاسی و ئابوری.. هه‌یان بوه، هه‌میشه له کاتی مه‌ترسی دا دژی بزوتنه‌وه‌ی ڕزگاری
نیشتمانی گه‌لی کوردستان ڕیک که‌وتون، پیکه‌وه نه‌خشه و پیلانی کوژاندنه‌وه‌یان داناوه و
ته‌قه‌لایان یه‌ک خستوه. ئه‌گه‌ر هه‌ندیک جاریش، یه‌کیک له‌م دو ده‌وڵه‌ته یارمه‌تی
جوڵانه‌وه‌یه‌کی کوردییان له شوینیک دا دابیت، له چوارچیوه‌ی وازیی تاکتیکی ده‌رنه‌چوه
بۆ یه‌کار هینانی مه‌سه‌له‌ی ڕه‌وای کورد و خه‌بات و خۆ به‌ختکردنی، وه‌کو هیزی زۆر بۆ
بردن و گوشار و ئاژاوه نانه‌وه، بۆ به ده‌سهینانی مه‌به‌ستیکی سیاسی، یا سپایی، ئابوری..
دژی ده‌وڵه‌ته‌که‌ی تر.
په‌نجا ساڵی ڕابوردو چه‌ندین نمونه‌ی هاوکاری ئه‌م دو ده‌وڵه‌ته‌ی تیا ئه‌بینری دژی
گه‌لی کورد، که دواییه‌که‌یان ڕیککه‌وتنه‌که‌ی شا - صه‌ددام بو له جه‌زائیر.

*

ڕوخانی ڕژیمی شا له ئیران، زۆر مه‌سه‌له‌ی له ناوچه‌که‌دا گۆڕی، یه‌کیک له‌وانه
تیکچونه‌وه‌ی په‌یوه‌ندی هاوکاری و ته‌بایی عیراق - ئیران بو، که به شه‌ڕی پروپاگانده و
ده‌سوه‌ردانه کاروباری ناوخۆی یه‌کتری ده‌ستی پی کرد، تا گه‌یشته وردە شه‌ڕی سه‌ر سنور و
له دوایی دا هه‌ڵگیرسانی جه‌نگ له به‌ینیان دا.
هه‌ڵگیرسانی جه‌نگ له به‌ینی ئه‌م دو ده‌وڵه‌ته‌دا، که به هۆی زیاد بونی ده‌رامه‌تی
نه‌وته‌وه له حه‌فتاکان دا، ماکینه‌یه‌کی سوپایی و پولیسی گه‌وره و خورتیان دروست کرد بو
بۆ دامرکاندنه‌وه و داپلوسینی گه‌له‌کانی خۆیان و بزوتنه‌وه شۆڕشگیرییه‌کانیان، هه‌لیکی
له‌باری ڕه‌خساند بۆ گه‌لانی ئه‌و دو ده‌وڵه‌ته به گشتی، بۆ ئه‌وه‌ی له یاتی ئه‌وه‌ی له شه‌ڕی دو
ده‌وڵه‌تی چه‌وسینه‌ردا، یه‌کتری شه‌ق و په‌ق بکه‌ن، هه‌وڵ بده‌ن بۆ ڕوخاندنی ده‌سه‌ڵاتی
زۆردارانه‌ی چینه حوکمڕانه‌کان و ڕوخاندنی بنچینه‌کانی «ئیستیبدادی شه‌رقی» که به
ناشیرینترین شیوه‌ی له‌م ساڵانه‌ی دوایی دا هه‌م له حوکمی صه‌ددام و حیزبه فاشیستییه‌که‌ی
دا و هه‌م له حوکمی خومه‌ینی و ده‌سه‌ڵاتی ئاخونده‌کانی ئیران دا، به دی ئه‌کری.
هه‌ڵگیرسانی جه‌نگ ئه‌گه‌ر بۆ گه‌لانی هه‌ردو ده‌وڵه‌ت هه‌لیکی له بار بوبی
بیقۆزنه‌وه، بۆ چاکتر کامل کردنی هه‌لومه‌رجی دۆخی شۆڕشگیرانه و گۆڕینی بنه‌ره‌تیی
خه‌ریته‌ی ده‌سه‌ڵاتی سیاسی چینه‌کانی هه‌ردو کۆمه‌ڵ، ئه‌وا بۆ گه‌لی کورد هه‌لیکی میژویی
ئه‌وتۆ بو که له میژوی نوی ی دا بۆ یه‌که‌مین جار بو شتی وای لی هه‌ڵبکه‌وی، که له ناو
هه‌ردو ده‌وڵه‌ت دا دو بزوتنه‌وه‌ی ئوپوزیسیونی خورت و دیموکرات و پیشکه‌وتنخواز، وه له
ناو هه‌ردو به‌شه‌که‌ی کوردستان دا دو جوڵانه‌وه‌ی سیاسی - چه‌کداری فراوانی خاوه‌ن بنکه‌ی
جه‌ماوه‌ریی تیدا بی، که هه‌ر یه‌که‌یان خاوه‌نی به‌رنامه و سه‌رکردایه‌تی و ڕیکخراوی سیاسی

و چەكدار بی، لە سەر خاكی خۆی.

هەرچەندە هاوكاری هێز و حیزبەكانی هەردو دیو لە ئاستی پێویستیەكانی قۆناغەكەدا نەبو، بۆ قۆستنەوەی ئەو هەلە مێژوییەی، كە دو دوژمنی دێرینە و بە هێزی گەلی كورد، سەدان هەزار سەربازیان دژی یەكتری لە مەیدانی جەنگێكی قورس و درێژی مایەپوچ دا بەر دابوە گیانی یەكتری، بۆ ئەوەی بە پێ ی گۆڕانەكانی هەلومەرجی نوێ ی نەتەوەیی و ناوچەیی و جیهانی.. چاو بگێرنەوە بە بەرنامەكانیان دا، بگرە بە ستراتیجی گشتی جولانەوەی كوردا لە هەردو دیو، بۆ دانانی ڕێوشوێنی ناوكۆیی كاركردن و، تەكاندانێكی نوێ بە خەباتی كورد، لە ڕوی دروشم و ڕێباز و شێوەی كاركردنی و هاوپەیمانیتیەوە.

لە كاتێك دا توانای ئەمە لە گۆڕێ بو، بەلام بۆچونی زاڵ و ڕەوتی ڕوداوەكان وەها ڕۆیشت كە هێزە سیاسی - چەكدارەكانی كوردستان هەر لایەنە لە دیوی خۆی دا و لە سنوری بەرنامە و ستراتیجی خۆی دا كەلك وەربگرێ لە هەلی خەریك بونی دەولەت و سوپای داگیركەری ولاتەكەی خۆی بە جەنگێكی دەرەكی قورسەوە، بۆ گەشە پێدانی جولانەوەكەی و بەدەسهێنانی سەركەوتنی سیاسی و سپایی.

هەلگیرسانی جەنگی عیراق - ئێران هەلێكی لەبار بو لۆ تێكرای ئۆپۆزیسیۆنی عیراق و دوژمنەكانی ڕژێمی صەددام، وە بە تایبەتی بۆ گەلی كورد و هێزە سیاسی - چەكدارەكانی كوردستان چونكە ئەیانتوانی كەلكێكی گەورەی لێ وەربگرن بۆ هەلگێڕانەوەی تای لاسەنگی تەرازوی هێزەكانی ڕژێم و گەلی كورد، بە تایبەتی كە صەددام و حیزبە فاشیستەكەی لە ئەنجامی جێگیربونی دۆخی ناوەوەی دا و لە ئەنجامی زیادبونی دەرامەتی نەوت و زیادبونی ژمارەی هێزە چەكدارەكانی و تفاقی جەنگی و دەسگرتنی تەواوی بە سەر هەمو شوێنە گرنگەكانی كوردستانی عیراق دا، لە دوای ئاشبەتاڵی ١٩٧٥، ناهاوتاییەكی سپایی گەورە و نابەرامبەرییەكی بێ وێنەی ئەوتۆ لە بەینی هێزی پێشمەرگە و هێزە چەكدارەكانی ڕژێم دا دروست بوبو، كە لە دابەشكردن و بەراوردكردنی ژمارەی هەردولادا، یەك پێشمەرگە زیاتر لە دوسەد چەكداری ڕژێمی عیراقی بەرئەكەوت. تەنانەت هەندێ جار جگە لە هێزی پیادە و جاش كە هێرشیان سەر مەفرەزە یا كەرتێكی پێشمەرگە، ژمارەی ئەو هالیكۆپتەرانەی بەشداری هێرشەكە ئەبون، لە ژمارەی پێشمەرگە پەلاماردراوەكان زۆرتر بون.

لە باری نابەرامبەری ماددی و بەشەری دا، لە بەینی پێشمەرگە و ڕژێم دا، هەر هێزی مەعنەوی و باوەر بو بە ڕەوایی و ڕاستی مەسەلەكە، كەموكوڕییەكانی پێشمەرگەی پڕ ئەكردەوە و لاسەنگییەكەی هەردوتای تەرازوی هێزەكانی ڕاست ئەكردەوە. لە گەل ئەوەش دا بە درێژایی ساڵانی ٧٦ - ٨٠. ڕۆڵە دلێرەكانی كوردستان نەك هەر بەوپەڕی قارەمانەتیەوە بەرگەی دژوارییەكانی هەلومەرجی خەبات و هێرش و پەلامارەكانی دوژمنیان گرت و بەس، بەلكو لە زۆر مەیدان و شوێن دا جلەوی دەسپێشكەرییان لە دەس دوژمن دەرهێنا و دەیان داستانی قارەمانێتییان نوسیەوە و سەدان سەركەوتنی دیاریان لە شەرگەكان دا بە دەس هێنا.

هەلبەتە هەلگیرسانی جەنگی عیراق - ئێران بۆ پێشمەرگە شاییەكی خۆش بو، چونكە سپا و هێزە چەكدارەكانی عیراق، ئیتر نەیانئەتوانی بەو خەستییە هێرش بهێنن و

بەو چەشنە لە کوردستان دا هێزەکانیان دابەش و جێگیر بکەن و بە گوێرەی توندبوونی شەڕ
و پێکادان ئەبوایە ئیتر هەندێ لە هێزە داگیرکەرەکانی کوردستان بکێشنەوە و بیبەن بۆ
مەیدانی جەنگ لە گەڵ ئێران و لە هەندێ شوێنی تریش دا هێزەکانیان تەنک بکەن.

خەریک بوونی هێزەکانی دوژمن بە شەڕی سپایەکی نیزامی هاوتای خۆیەوە لە
جبهەیەکی ترەوە، دەسەڵاتی لە کوردستان دا لاواز ئەکرد و توانای شەڕکردنی کەم ئەکردەوە
و نوقتەی زەعیفی لە ناوچەکان و بازێڕ و ئۆردوگاکان دا ئەدا بە دەستەوە.. ئەمانەش
هەموو زەمینەی لەباری بەرزکردنەوەی رادەی چالاکی و وەشاندنی دەستی کارێگەریان لە
دوژمن خۆش ئەکرد. بەڵام لە هەمان کات دا خەریک بوونی هێزی پێشمەرگەش بە شەڕی
ناوخۆ و ناکۆکی دروستکراوی لاوەکییەوە، یەکێ هێزەکانی پێشمەرگەی ئەخست بۆ
قۆزستنەوەی ئەم هەلە و بە گەڕ خستنی هەموو وزە و توانای دژی ڕژێم و هێزە
داگیرکەرەکانی لە کوردستان دا.

تەرخانکردنی هەموو تەقەلا و توانای هێزی پێشمەرگە و ڕێکخراوەکانی یەکێتیی
نیشتمانی لە مەیدانی چەکدار، سیاسی، ئیعلامی.. دا بۆ ئەنجامدانی فرمانی سەرەکی لە
یەکلاچوونی ڕژێم دا، لە هەلومەرجی ئەوسای کوردستان دا کە هۆکانی شەڕی لایەلا و
تەقینەوەی ناکۆکی لاوەکی لە کایەدا بوو، پێویستی بە چوارچێوەیەکی گشتی جوڵان و
بزوتن بوو لە سەر ئاستی کوردستان، عێراق و، ناوچەکە، بۆ کۆکردنەوەی هەموو هێز و
تواناکان دژی ڕژێم، یا هیچ نەبێ خاوکردنەوەی گرژی نێوانیان، بۆ ئەوەی لە باتی ئەوەی
بە یەکترییەوە خەریک بن هەر یەکەیان لە قوڵی خۆیەوە بە دوژمنەوە خەریک بێ.

*

هەڵگیرسانی جەنگی عێراق - ئێران دۆخێکی وەهای دروست کرد کە دەوڵەتەکانی
عێراق و ئێران، وە هێزەکانی دژی عێراق و هێزەکانی دژی ئێران، هێز و دەوڵەتانی ناوچەکە
تێکڕا کەوتنە جوڵان و وەرگرتنی هەڵوێست و، ناچاری کردن ڕیزبەندییەکی نوێ هەڵبژێرن لە
دۆستایەتی، دوژمایەتی، هاوکاری، نۆکەرایەتی، بێلایەنی..

لە لایەکەوە - دەوڵەتی عێراق و دەوڵەتی ئێران هەریەکەیان هەوڵی ئەدا بۆ ئەوەی
سود لە خەباتی کورد وەربگرێ لە ململانێی سپاییەکەی دا وەکو بەشێک لەو جەنگەی دژی
ئەوی تر ئەیکرد، وە هەر یەکەیان بە پێ ی تێگەیشتن و بۆچوونی خۆی، هەوڵی ئەدا دەس
بخاتە ناو هێزە سیاسی و تەنانەت هێزە عەشایەری و دینییەکانی کوردیشەوە، وە لە ڕوی
سپایی و سیاسییەوە کەڵک لە جوڵانەوەی کورد وەربگرێ بۆ قورسکردنی تای تەرازوی
هێزەکانی خۆی لە شەڕدا.

لە لایەکی تریشەوە - حیزب و هێزەکانی کوردستان، ئەوانیش هەر یەکەیان بە پێ
ی بۆچوون و تێگەیشتنی خۆی، هەر یەکە لە لای خۆیەوە کەوتە وەرگرتنی هەڵوێست و
هەوڵدان بۆ وەرگرتنی کەڵک لە تەقینەوەی ناکۆکییەکانی بەینی عێراق و ئێران و گەیشتنی
بەوپەڕی توندوتیژی واتە پلەی جەنگ، چ بە دروستکردن یا بەهێزکردنی پەیوەندی لە گەڵ
ئێران و چ بە دروستکردنی (محور) لە گەڵ هێزەکانی تردا دژی ڕژێمی عێراق.

بێگومان جموجوڵ و هەوڵدانی هیچ کام لەو لایەنانەش، بە کارێکی سەیر و
ناتاسایی دانانرێ، بەڵکو لە هەلومەرجێکی وەهادا شتێکی ئاسایییە و چاوەڕوانکراوە.

حشع و حسک و قم کە لە هێزەکانی کوردستانی عێراقن و ڕێگەی ململانێ ی

چەکداریان گرتوە دژی ڕژێمی عێراق.. هەر یەکەیان بە جۆرێک و بە شێوەیەک
هەلویستی خۆی دیاری کرد لە جەنگی عێراق - ئێران، وە هەر یەکەیان بە جۆرێک
هەلویستەکەی خۆی هەم بە داوودەزگا ڕەسمیەکانی ئێران ڕاگەیاند و دایە دەزگاکانی
ڕاگەیاندنی ئێرانی (رادیو، تەلەفزیون، ڕۆژنامە)، وە هەم لە بەیان و بلاوکراوەکانی خۆیان
دا چەند بارەیان کردوە. ئەگەرچی ئەمانە بە جیا هەلویستی خۆیان دەربڕی بو، بەلام
ناوەرۆکی هەلویستی هەر ۳ لاکەیان چەن حوکمێکی لە یەکچوی تیا ئەخوێنرایەوە کە
بریتی بون لە:

أ. دەربڕینی نارەزایی توندوتیژ لە هەلگیرساندنی شەر.
ب. توندکردنی مسئولیەتی هەلگیرساندنی شەرەکە لە ملی عیراق.
ج. پشتیوانیکردنی تەواو لە حکومەتی ئێران دژی حکومەتی عیراق.

هێزەکانی ئێمە یەکێک بو لەو هێزانەی ئەبوایە لە هەمو لایەک زیاتر سود لە
ناکۆکی ئێران - عێراق و جەنگەکەی بەینیان وەربگری، بە تایبەتی چونکە لە چاو
هێزەکانی تردا، ئەم گەورەترین هێزی شەرکەر بو دژی عێراق لە سەر ئەرزی کوردستان.
جگە لەمەش هێز و ڕێکخراوەکانی ئێمە و جەماوەری خەلک.. لە ماوەی چەن سال شەری
نابەرامبەر و خەباتی سەخت و دژواردا ئازارێکی زۆریان لە دەس حکومەتی عیراق و دەزگا
دامرکێنەرەوەکانی و هێزە داگیرکەرەکانی چێشت بو، کە لە هی ئەوانیتر زۆرتر بو، ئەمەش
هەمو جۆرە هەولدان و هاوکاریەکی حەلال ئەکرد دژی ڕژێمی عیراق بۆ «هەق» لی کردنەوە
و «هەق» لی سەندنی. لە مانەش هەموی گرنگتر: ئەو کاتە چەندین بەرژەوەندی و قازانجی
گرنگ و کاریگەری لە ناو ئێران و لە بەر دەسەلاتی ئێرانیەکان دا بو، بە تایبەتی
وەجبەیەکی گەورەی چەک، کە لە ولاتێکی دۆستەوە، ینک لە سەر پەیمان و بەلێنی
ئێرانیەکان، گواستبویەوە ناو ئێران بۆ ئەوەی لەویوە بیگەیەنێتە کوردستانی عیراق.. لە
گەل ئەمانەش دا هەمو، ئێمە ئامادە نەبوین لەو هەلومەرجەدا بە پێچەوانەی هەلسەنگاندن و
بۆچونەکانی خۆمانەوە هەلپەرستانە بجولێینەوە، یان هیچ مەرجێکی ئێرانیەکان قەبول
بکەین کە لە گەل سەرەتاکانی خۆمان یا قازانج و دەسکەوتە بنچینەییەکانی نەتەوەی کوردا
نەگونجی.

هەر لەم ڕوانگەیەوە هەم (عرض) ی ئێرانی و مەرجەکانی ئەوانمان دایەوە دواوە و
پشتیوانیمان لە حکومەتی ئێران نەکرد، بەو جۆرەی ئەوان ئەیانویست. لەو شەرەدا دژی
عێراق. هەم (عرض) عیراقی و مەرجەکانی ئەوانیشمان ڕەت کردەوە و پشتیوانیمان لە
حکومەتی عیراق نەکرد، بەو جۆرەی ئەوان ئەیانویست لەو شەرەدا دژی ئێران. بەلکو لامان
وابو کە ئەبی ئەو هەلە مێژوییە بقۆزرێتەوە و شەر توند بکری، مەک لە گێژاوی (مساومە)
ی سوک و پروپوچ و کاتی دا لە گەل دەولەتی ئێران یان لە گەل دەولەتی عیراق دا بزر
بکری و لە دەس بدری و، گەلی کورد بهاوێژرێتە داوی فروفێلی تاکتیکیی یەکێکیانەوە و
لە ئەنجام دا ببێتە قوربانیەکی سەربڕاوی ڕێککەوتنەوەی ئەوان. وە ئەگەر (مساومە)ش
هەر پێویست بی، ئەوا ئەبی لە گەل هێزە ناکۆک و جیاوازەکانی کوردا بکری نەک لە گەل
داگیرکەرانی کوردستان. (کۆمەلە، شوباتی ۱۹۸۲)

*

ئەنوەر حەسەن و قازان

ئەنوەر حەسەن گەنجێکی هەڵکەوتوی کەرکوک بو. کە دوای ئاشبەتاڵ گیرا خوێندکاری کلیەی هندسە بو لە بەغداد. ئەویش وەکو هاوڕێکانی حوکم درا و لە زیندانی ئەبو غریب دا مابوەوە تا لە عەفوی ٧٨ دا بەر بو. هەر ئەو کاتە هاتە ریزی پێشمەرگەوە. لە گەڵ ٩ کادری تر نێردران بۆ لوبنان بۆ مەشقی جەنگی دوای گەڕانەوەی کرا بە فەرماندەی هەرێمی ٢ ی کەرکوک.

لە ڕۆژی ٥ ی مارتی ٨٢ دا هێزێکی تێکەڵاوی جەیش و جاش بە پشتیوانی هالیکۆپتەر لە گوندی قازان هەڵی کوتایە سەر ئەنوەر و هاوڕێکانی کە بە هەمویان ٢٢ کەس بون. لەم شەڕە نابەرامبەرەدا ١١ کەس کوژرا: ئەنوەر حەسەن. ڕزگار جەلال (هێمن) ماموستا عەبدولخالق صالح (ئاسۆ). ماموستا عەبدوللا صالح (چیا). سوارە شیخ صدیق. کامەران مام عومەر. کەریم چەمچەمالی (گۆران). نوعمان عەبدی. حەمە شوکر بلوکێنی. نەجمەدین فاتیح (شەپۆل). موەفەق تەقی.

زۆری ئەم پێشمەرگانە کەرکوکی بون. ڕاستیەکەی ئەمە زەرەرێکی گەورە بو، چونکە پاشەڕۆژێکی باش لە ئەنوەر و هەندێ لە کادرەکانی تر ئەکرا.

*

یەکێتیی نوسەرانی کوردستان

حەمەی حەمە باقی لە زیندان بەربوبو، بەلام نەیئەویست خۆی پیشانی کەس بدات. حەمە پێش گرتنی لە چەند کۆڕێکی ئەدەبی دا شیعری خوێند بوەوە یەکێکیان بە ناونیشانی «بروخێ بێدەنگی» شیعرەکانی ڕەمزی بون، بەلام دژی زوڵموزۆری بەعس. یەکێ لەو برادەرانەی، لە ڕاگەیاندنی یەکێتی کاری ئەکرد، لە گەڵ هەندێ لە ئەدیبەکانی سلیمانی نێوانی خۆش بو. هات بۆ لام باسی حەمە و هەڵویستی ئازایانەی سیاسی بۆ کردم، داوای لێ کردم نامەیەکی بۆ بنوسم. ئیمە پێشتر ناسیاویمان نەبو. نامەیەکم بۆ نوسی. برادەرەکە بۆی نارد و دوایتر خۆی بە نهێنی چوەوە بۆ سلیمانی. چەند نامەیەکم پێ دا نارد بۆ چەند کەسێکی تریش. حەمە بڕیاری دابو بێتە شاخ و بێ بە پێشمەرگە. لە شۆڕشی ئەیلول دا ماوەیەک لێپرسراوی ناوچە بو لە هێزی ڕزگاری.

حەمە هاتە دەرەوە قسە و باسی سیاسی و ئەدەبی زۆرمان کرد. بە لایەوە چاک بو لە گەڵ ئەدیبەکانی کورد لە ناو شارەکان دا پەیوەندی دۆستانە دابمەزرێنین. لە سەر داوای ئەو، مامجەلال و من، چەندین نامەمان نوسی بۆ زۆری ئەدیبە کوردەکان لە سلیمانی، هەولێر، بەغداد.. خۆی نامەکانی بۆ بردن. ئەمە کارێکی باشی تێ کردن. کە هاتەوە بیری دامەزراندنی یەکێتی نوسەرانی لە لا گەڵاڵە بوبو بە تایبەتی بەعس بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی نوسەرانی کوردی دابو.

تاقمی ئەدیب و نوسەر ڕویان کرد بوە شاخ، بەلام بە سەر حیزبەکان دا دابەش بوبون. لە مانەش هەندێکیان خۆیان خۆیانیان بە ئەدیب و نوسەر ئەزانی، ئەگینا بە پیوانەی ئەدەبی بە «کۆلکە ئەدیب» یا بە «کۆلکە نوسەر» یش دانئەنران.

هەڵویستی یەکێتی لە یەکێتیی نوسەران بە مجۆرە بو: یەکێتیەکەیان دور بێ لە دەستێوەردانی حیزبەکان و، «نان و ئازادی» و پێویستیەکانی چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان بۆ دابین بکرێ.

هەندێ لە نوسەرەکان چەند کۆبونەوەیەکیان کرد و، بە هاودەنگی لە گەڵ ژمارەیەکی زۆر لە نوسەرانی شار، «یەکێتی نوسەرانی کوردستان» یان پێک هێنا و، گۆڤاری «نوسەری کوردستان» یان بڵاو کردەوە
لەم گۆڤارەدا بەرهەمی ئەدەبیی نوسەرانی شاخ و چەندین کەس لە نوسەرانی ناسراوی شار، وەکو: شێرکۆ بێکەس، حسێن عارف، مستەفا سالح کەریم، رەئوف بێگەرد، دلشاد مەریوانی، تایەر سالح سەعید.. لە ژێر ناوی نهێنی دا، بڵاو کرایەوە.
هەروەها چەندین کۆمەڵەی شیعر، لەوانە: کۆمەڵە شیعری حەمەی حەمە باقی، شێرکۆ بێکەس، حسێن مەولود، جەمیل رەنجبەر و، کۆمەڵە چیرۆک و بابەتی تر لە کتێبی سەربەخۆدا بڵاو کرایەوە.

*

## هەوڵێکی سەرنەکەوتو لە گەڵ حسک

حەمەی حەمە باقی کە هات بۆ شاخ، هەوڵی ئەدا بە هاوکاری لە گەڵ نوسەرانی کە دابەش بوبون بە سەر لایەنەکانی جودا، یەکێتیی نوسەرانی کوردستان گەشە پێ بدا. لە هەمان کات دا لەو ڕێگایەوە زەمینەی جۆری لە ئاشتبونەوە خۆش بکا. حەمە و زۆر کەسی تریش زۆر جار باسی هەوڵی ئاشتبونەوەیان لە گەڵ ئەکردین و، ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ ناوبژی و هێنان و بردنی نامە و پەیام.
حەمە لە گەڵ حاجی برایم دۆستایەتی کۆنیان هەبو. بە هەوڵی ئەو دانیشتنێکی لە شێنی ڕێک خست لە یەکێتی عومەری حاجی عەبدوڵلا و من و، لە حسیک تایەری عەلی والی و حاجی بەشدار بون.
پاش هەندێ قسە و باس هاتینە سەر باسەکان. حاجی لە میانەی قسەدا وتی: «مامجەلال برا گەورەی ئێمەشە..» من زو قسەکەم پێ بڕی، وتم: «کاک حاجی با واز لەم جۆرە موجامەلانە بهێنین. نە ئێوە مامجەلال بە براگەورەی خۆتان ئەزانن و، نە ئەویش خۆی بە براگەورەی ئێوە ئەزانێ. ئەوە چەند ساڵە ئێوە قسەی پێ ئەڵێن. چاکتر وایە بە ڕاشکاوی باسی هۆی ناکۆکییەکان بکەین.»
هەردو لامان ئارەزویەکی قوڵمان بۆ ئاشتبونەوە و ئاساییکردنەوەی پەیوەندیەکانمان دەربڕی. لە بەر ئەوەی لە دەس پێ کردنەوەی شۆڕشەکەدا لە گەڵ ئەمان پێکەوە بوین و، ساڵانێکمان لە ناو یەکێتی دا پێکەوە بە سەر برد بو. لە ناو ڕێکخراوەکانی تردا ئەمانمان لە هەمویان بە نزیکتر دائەنا لە خۆمان. ئێمە باری سەرنجی خۆمان بۆ ڕون کردنەوە. زۆر لە مێژ بو ئێمە لامان وابو هۆکانی هەڵگیرسانی شەڕی نێوان ڕێکخراوە کوردییەکان: فرە - لەشکری و، حوکمڕانی و، پارەیە.. پێشنیارمان بۆ کردن: هەر ڕێکخراوە لە کاروباری ئایدیولوجی، سیاسی، ڕێکخراوەیی دا سەربەخۆ بێ، بەڵام داوودەزگاکانی جوڵانەوەکە، بە تایبەتی پێشمەرگە و ڕاگەیاندن و دەسکەوتی دارایی، وەکو نمونەیەک بۆ دەسەڵاتی پاشەڕۆژی کورد، یەک بخەین.
لەو کاتەدا توانای یەکێتی زۆر زیاتر بو لە هی ئەوان. ژمارەی پێشمەرگەی زۆرتر و، سەرچاوەی دەسکەوتی دارایی فراوانتر و، دەزگای ڕاگەیاندنی: رادیو و چاپخانە، گەورەتر بو. لە هەمو ئەو شتانەدا ئەبوین بە هاوبەش. ئەوان وەکو حیزب قازانجێکی زۆرتریان ئەکرد. بۆ ئەوەی دڵنیایان بکەین کە ئەوە بۆ هەڵلوشینی ئەوان نیە، پێشنیارمان

جۆرە هەنگێکی کێوی هەیە وردترە لە هەنگی ئاسایی لە ناو کونە بەردا هێلانە ئەکا، لە هەندێ شوێن پێ ی ئەڵێن: «شەمەتلینکە» و لە هەندێ شوێنی تر: «شەپەتوکە». ئەمیش شان هەڵئەبەستێ و هەنگوینی تێ ئەکا. تامی هەنگوینەکەی خۆشترە لە هەنگوینی ئاسایی، بەڵام کەمە، هەر بەشی پارویەکە. پێم وانیە لە سەر شەمەتلینکەی کوردستان هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستی کرا بێ.

دوای ڕاگوێزانی دێهاتی سنور ژمارەیەکی زۆر هەنگ بەرەڵلا بوبون، لە کلۆری دار و کونی بەرد و ئەشکەوت دا جێگیر بوبون. هەنگدزز ئەیان دززینەوە. لە سەر کانی چاودێری هەنگەکەیان ئەکرد کە ئەهات بۆ ئاوخواردنەوە و، دوای هەستانی بۆ فڕین چاودێری هەنگەکەیان ئەکرد چەند بەرز ئەبێتەوە و، بەرەو کوێ ئەڕوا، پەوەدا شوێنەکەیان دیاری ئەکرد و ئەچون بۆ دززینەوە و گرتنەوە و بڕینی.

پێشمەرگەکانی دولی بالیسان و هەندێ لە خەلکی ناوچەکە هەندێ هەنگیان گرت بوەوە و، کردبویانە شەلکەوە و، لە هەنگەلانی پچوک و نەبینراودا دایان نابو. لەشکرەکەی پارتی کە هات بون، دوای ئەوەی زۆریان بری بو شەلتەکانیشیان لە ناو هەلکیشا بو، بۆ ئەوەی هەنگەکان برن.

*

## کاروباری لوجستیکی

لە تەقەمەنی و خواردەمەنی و پێخەف دا ناتەواو بوین. شۆرش حاجیم کرد بە لێپرسراوی کاروباری لوجستیکی کرینی ئازوقە، تەقەمەنی.. تەقەمەنی مان لە قاچاخچی بە نرخێکی گران ئەکری. چەردەیەکی باش فیشەکی کلاشینکوف، بی کەی سی، گوللەی ئاربیجی، نارنجۆکمان.. کری. ئازوقەیش بە زوری نان و هەندێ خواردنی قوتو بو. پێشمەرگەکان هەمو ڕۆژێ ڕادیوی پارتیان ئەکردەوە. جنێوی زۆر ناشیرینیان بە یەکیتی ئەدا و، باسی لێشاوی خواردەمەنی، تەقەمەنی، کەلوپەلی ئەکرد کە عیراق بە لۆری لە دولی خانەقاوە بۆ یەکیتی ئەنێری. ئەم پروپاگاندە درۆیەی کە هەمو ڕۆژێ ڕادیۆکەیان دوبارەی ئەکردەوە، لە دو لاوە بۆ ئەوان بە زەرەر بو:

– وورەی هێزەکانی خۆیانی ئەڕوخاند، کە ژیانیان لە بەرزاییەکانی قەندیل دا بە هۆی سەرما و برسێتی و دوریان لە کەسوکار و چۆلیی ناوچەکەوە زۆر ناخۆش بو.

– قینی پێشمەرگەکانی یەکیتی هەڵئەساند و، ڕقیانی لە جود ئەوەندە ئەستور ئەکرد کە بە هیچ جورێ دەستیان لێ نەپارێزن و، وەکو خائینی دززن و، بەکرێگیراوی بێگانە ڕەفتاریان لە گەڵ بکەن. پێشمەرگەکان دانە جیرەیان بو لێبیان.

*

شوێنێک لە زنجیرەی بیبە بە ناوی بەرمەیدانەوە بە دەس چەکدارەکانی پارتیەوە بو، ئەبیروانی بە سەر جادەکەدا و، بە سەر بەشێکی هێزەکانی ئیمەدا، زۆرجار لەویوە تەقەیان ئەکرد و، خەلکیان بریندار ئەکرد. حەسەن کوێستانی و عەلی نەبی بە تەما بون پەلاماری بدەن ئەو شوێنەیان لێ بسێنن. شەو بو بە تەقەیەکی گەرم و، گوللەی ئاربیجی لە تاریکی شەوەکەدا وەکو پشکۆی ئاگر ئەهات و ئەچو. من لە زارگەلێوە چاودێری شەڕەکەم ئەکرد. وامزانی هێزەکەی ئیمە پەلامار ئەدەن، کەچی هێزەکانی پارتی هەمان شەو پەلاماریان دابو شوێنەکەی ئیمە بگرن. لەم شەڕەدا برایەکی تری حەسەن و پێشمەرگەیەکی تر کوژران، بەڵام

حەسەن شوێنەکەی بەرنەدا و دانەبەزی تا هێرشەکەی پارتی تێک شکێنرا.

*

کۆبوونەوەیەکم لە گەڵ فەرماندەکانی پێشمەرگە کرد کە چی بکەین؟ دوو ڕەئی جیاواز بون: هەندێکیان ئەیانوت لەم شاخە ساردە بکشێینەوە چیاکانی خوارووی جادە: دەرە بی و تەورە و، لەوێ دابمەزرێین. هەندێکی کە ئەیانوت ئێمە پەلاماریان بدەین و، بیانکەینەوە بە دیوی ئێران دا. ناظم، کە یەکێ لە فەرماندەی بەتالیۆنە ئازا و هەڵکەوتووەکانی شۆڕشی ئەیلول بو، لەم ڕەئیەدا بو، وتی: «ئەوانەی ئەڵێن لەم شاخانە بکشێینەوە بۆ شاخەکانی تەوێر، لەوبەریش کە هاتنە سەرمان ئەڵێن با بچینە کارۆخ و بەرمکە دیفاع بکەین، لەویش کە هاتنە سەرمان ئەڵێن با بچینە هەورێ.. ئاخیرییەکەی وای لێ دێ ئێمە لە دەشتی کەرکوک شەڕیان لە گەڵ بکەین.. چاکتر وایە شەڕەکە لێرە بکەین و لێرە بیانشکێنین!»

*

خۆ ئامادە کردنمان تەواو کرد. لە گەڵ پێشمەرگەکانی گەرمیان دا بە کەلەکی باڵەییان دا سەرکەوتم بۆ نزیک سەنگەری پێشمەرگەکان. چەند کەسێکی شارەزام هەڵبژارد بچن بۆ نۆڕینی شوێنەکانی جوت. هاتنەوە ئاگاداریی وردیان لە سەر شوێنەکانیان و قەوارەی هێزەکانیان کۆ کرد بووەوە.

هەندێ سەرچاوەمان پەیدا کرد بو دەنگوباسەکانی ئەوانیان بۆ ئەناردین. ئەوانیش زانیاری باش و بە کەڵکیان دەس ئەکەوت. هەواڵەکانی بۆمان ئەهات وایان ئەگەیاند ئیدریس لە دێیەکی نزیک ئەوان بو لە دیوی ئێران ئاگاداری کرد بون کە دێت بۆ سەردانیان. من بەم هەواڵە زۆر خۆشحاڵ بوم. چەند ساڵ بو بنەماڵەی بارزانی لە واشینتۆن و کەرەج دانیشت بون و، خەڵکیان بۆ شەڕی ئێمە ئەنارد، وا ئێستا خۆی دێت بۆ مەیدانی شەڕ. ماوەیەک هێرشەکەم ڕاگرت بە هیوای گەیشتنی ئیدریس. هەر دەر نەکەوت. ژیانیشمان بە شاخەکەوە زۆر ناخۆش بو، ئاوی کانیەکانی ئەوەندە سارد بو بە زەحمەت دەس و دەموچاوی پێ ئەشۆرا. هەمومان پشتی دەست و ڕومەتمان قڵیشا بو، ڕوخسارمان تاریک هەڵگەڕا بو. شەو زۆر سارد و خواردنمان زۆر خراپ بو. هێڵەکانی ڕوبەڕو بونەوەمان لە یەکتری نزیک بو، لە تەقەی بەرامبەردا ۲۰ کەس زیاتر بریندار بوبو. بەڵام هیچ کەسی لە پێشمەرگەکان خۆی نەئەدزییەوە.

*

شەڕە جنێو بە هۆکی تۆکی

ڕۆژێکیان هۆکی تۆکیەکەم کرد بوەوە لە گەڵ عەلی پچکۆڵ قسەم ئەکرد. کابرایەک هاتە سەر خەت. قسەکانی پێ بڕیم. پرسی: «تۆ فڵانی؟»

وتم: «بەڵێ!»

جنێوێکی بە دایکم دا وتم: «دایکم نەماوە!»

جنێوێکی بە ژنەکەم دا وتم: «ژنم نیە!»

جنێوێکی بە خوشکم دا وتم: «هەموویان شوویان کردوە مێردیان هەیە!»

وتم: «بۆچی لە مەسئولەکانتان ناپرسن لە باتی ئەوەی هەمو ساڵێک جارێک بتانهێنن بۆ سەر یەکێتی و هەندێکتان بە کوشت بدەن و بە شکاوی بتانگێڕنەوە بۆ ئێران، بۆچی لە گەڵ یەکێتی ڕێک ناکەون بە خۆشیی و بە بێ شەڕ بێنەوە بۆ کوردستان؟»

وتی: «ئیمە عەینەک لە چاوەکانی پشتتاشان نین - مەبەستی شیوعیەکان بو کە لە شەڕی ئاباردا تیشکا بون - ئیمە شێر و پڵنگەکانی بادینانین.. ئیمە هاتوین دایکت....»

کوڕەکە بە کرمانجی ئەدوا، لام سەیر بو بادینانی کە بە ئەدەب و مەعریفەت ناسراون، جنێوفرۆشی وەهایان تی دا بی. سەیرم کرد قسەکانم کاری تی ناکا، وتم: «شێر و پڵنگی بادینان گوی بگرە! هەولێری قسەیەکیان هەیە ئەڵێن: مەیدان مشکان نەیانخواردوە! لە مەیدانەکەدا یەکتری ئەبینین»

بە هەمو هۆکی تۆکییەکانم ڕاگەیاند: ئیتر دایبخەن و جارێکی تر قسەی پی نەکەن تا خۆم بە نامە ئاگاداریان ئەکەمەوە.

*

مەیدانی شەڕەکەم کرد بو بە ۳ شەرگە:

شەرگەی سەرەکی زنجیرە چیای بیبە بو کە هێزەکانی پارتی و بارزانیەکانی لی دامەزرا بو.

شەرگەی خەریک کردن، ئەمیش دو قوڵ بو:

قوڵی یەکەم، لە سەر چیای بیبە، نزیک بنکەکەی من کە ئەبو عەلی ئەبی پەلاماریان بدا و، هەمویان لایان وابو ئەمە هێرشی سەرەکی لی ئەکری.

قوڵی دوەم، زنجیرە گردێکی نێوان جادەی خانەقا و گوندەکانی ئەندزی، لێوژی، سلێ و بۆلی.. کە هێزەکانی حسک و حشعی لی دامەزرا بون، ئەبو هێزەکەی عەلی پچکۆل پەلاماری بدا.

لە شەڕی مانگی مایس دا، حشع و حسک جەزرەبەیان پی گەیشت بو، ئەمانویست ئەمجارەیان جەزرەبە لە پارتی بسرەوێنین و، غروریان بشکێنین. لە بەر ئەوە ئەرکیەزمان کردە سەر ئەوان.

جارێکی تر تاقمێک پێشمەرگەی تێکەڵاو لە شارەزا و نەشارەزام نارد بچن بو سەیری شوێنەکانیان و، رێگاکانی پەلاماردانیان. خۆم ناوچەکە شارەزا بوم. جاری یەکەم ساڵی ۱۹۷۱ و جاری دوەم لە کاتی کارەساتی هەکاری دا ساڵی ۱۹۷۸ دی بوم و، ئەو چەند رۆژەیش کە بە شاخەکەوە بوم، بەردەوام سەیرم ئەکرد و لە شارەزاکانم ئەپرسی و، بیرم لی ئەکردەوە: ڕوبەرو پەلاماریان بدەین، یان لە لاوە؟

ڕوبەرو توشی زیانی گیانیی زور ئەبوین و، ئەوانیش وایان چاوەری ئەکرد لەویوە پەلامار بدرین. بەلام بە درێژایی دولی خەلاپ بۆشایی بو، ئەوان پریان نەکرد بوەوە و هێزیان لی دانەنا بو. ئەمانتوانی لەویوە بە نهێنی لێیان بسورێین. دولەکە درێژ بو ئەوان بە درێژایی بەرمەیدان - کونەکۆتر - بیبە دامەزرا بون و، یەکی لە بنکەکانی فەرماندەییان لە سەر کانی کونەکۆتر دانا بو. لە باتی ئەوەی بە ڕیچکە و لە یەک ڕیزدا پەلاماری یەک شوێن بدەن، من وەهام دانا کە بە پانایی شاخەکە لە شێوەی «گەلە درو» دا لە ۸ جێگاوە پەلاماریان بدەن.

هێزەکانم گولبژێر کرد، چالاک و تەندروست و بە زاتەکانم جیا کردەوە، شارەزا و نەشارەزا و، پێشمەرگەی ناوچەکە و پێشمەرگەی دەرەوەی ناوچەکەم تێکەڵاو کرد و، ۸ تاقمی ڕێکوپێکم لی پێک هێنان.

هەر تاقمی فەرماندەی یەکەم و دوەم و سێیەم و، شوێنی هێرشەکەیان و ئامانجەکەیانم بۆ دیاری کردن و، داوام لێ کردن سەعات ٩ ی شەو خۆیان و پێشمەرگەکان بێن بۆ دوایین کۆبونەوەی پێش هێرشەکە.

لە کاتی دیاریکراودا ئامادە بون. هەمویان ٢٣ . کەس بون. بەلام هەلبژاردەی هێزەکەی یەکێتی و، لە پیاوە هەرە ئازا و دلسۆزەکانی کورد بون. لە قسەکانم دا گرنگیی سیاسی هێرشەکە و، شکاندنی جودم بۆ رون کردنەوە و ئاگادارم کردن کە:

- نابێ لە کاتی رۆیشتن دا قسە و، دەنگە دەنگ بکەن و یەکتری بانگ بکەن.
- نابێ لایتی دەس بە کار بهێنن، پیلەکانی هەلبگیرنەوە، نابێ جگەرە بکێشن.
- نابێ هۆکی تۆکی بەکار بهێنن تا تەقە دەس پێ ئەکا.
- هەمو کەسێ ئەبێ پێشمەرگەکەی بەردەمی و، ئەوەی دوای خۆی بناسێ و، نابێ ئەو ریزە لە هیچ حالەتێک دا، جگە لە کوژران و بریندار بون، تێک بدا.
- هەر کەس کوژرا لە شوێنەکەی خۆی بە جێ ی ئەهێلن تا شەر بە لادا ئەکەوێ و، هەرکەس بریندار بو یەک کەس لە گەلی ئەگەرێتەوە.
- ئەگەر فەرماندەی یەکەم کوژرا، هی دوەم جێگەی ئەگرێتەوە و، هی دوەم کوژرا، هی سێیەم جێگەی ئەگرێتەوە لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا کە پێیان سپێردراوە.

سەعات ١٠ ی شەو خواحافیزیم لە تاقمی یەکەم، کە رێگاکەی لە هەمویان دورتر بو، ئینجا تاقمی دوەم و سێیەم تا هەشتەم کرد و، بە رێ کەوتن.

*

عەلی نەبی خۆی ئاگاداری جولانی هێزەکە و، ئەرکەکانی خۆی بو، بە نامەیش ئاگاداری قزلی عەلی پچکولم کرد: کە گوێیان لە تەقەی شەر بو، لە بەرزاییەکانی بیبە، ئەوانیش هێرشەکەیان دەس پێ بکەن و، هۆکی تۆکییەکانیان بکەنەوە.

سەعات ٤،٢٠ دەقیقەی بەیانی رۆژی ١ ی ئەیلول، هێشتا تاریک و رون بو تەقە دامەزرا و، لە هەمو شوێنەکان وەکو دامان نابو شەر دەستی پێ کرد. دوای ١٥ دەقیقە هۆکی تۆکیەکانی: سەید کەریم، رەحمان سەیدە، عەزیزی داود، برایمی حاجی کوێخا، قادر خەیات.. مژدەیان دا کە ئەرکی خۆیان بە جێ هێنا و، هێزەکانی پارتی دەستیان کرد بە هەلاتن. عەلی نەبی پش سەرکەوت، من و حەسەن کوێستانی و عەبدولرەحیمیش بە دوای دا.

*

یەکی لەو دیمەنانەی هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە لە کاتی سەرکەوتن دا پێشمەرگەیەکی تیپی سەفین ناوی فاروق بو بە سەختی بریندار ببو، لە بن بەردێک دا دانیشت بو خوێن لە برینەکەی سنگی ئەچۆڕا، دوای مردنی کە گیرفانی گەرا بون ٢٥ . فلس لە گیرفانی دا بو، کە سەرکەوتم بۆ شەرگە و لاشەی کوژراوێکی پارتییان پیشان دەم ٢٠٠ . تمن لە گیرفانی دا بو، لە دلی خۆم دا بە زەییم بە خۆم و بە گیانبازەکانی گەلەکەم دا هاتەوە. لەم شاخە بەرزە لە سەرچی شەر ئەکەن؟

شەری سەرەکی تەواو بو. دنیا روناک ببوەوە. هێزێکمان لە لوتکەی بۆلی دانا بو کشانەوەکەیان بپارێزێ. چاومان لێ بو بە کۆمەل بە قەندیل دا بە رێ کەوتن بەرەو ئێران. لەم سەفەرەدا بە زوری عەبدولرەحیم بە هۆکی تۆکیەکەی من قسەی ئەکرد. وتم: «بزانە شێر

و پلنگەکانی بادینان نادوزیتەوە هەندی قسەیان لە گەل بکەم!» عەبدولرەحیم چەندی هاواری
کرد کەسیان وەلامی نەدایەوە، نازانم خەریکی راکردن بو، یا کوژرا بو.

*

حەسۆ لە کونەکوتر

پارتی، بە تایبەتی بارزانییەکان، زەرەریکی زوریان لی کەوت. دو لە فەرماندە ناسراوەکانیان: حەسۆ میرخان ژاژوکی و عەبدولرەحیم جەسیم کوژران. هەردوکیان لەوانە بون لە گەل مەلا مستەفا چو بون بو مەهاباد و، دوایەتر بو یەکیتی سۆڤیەت. لە شورشی ئەیلول دا حەسۆ فەرماندەی هیزی کاوە بو لە قەلادزە و، عەبدولرەحیم فەرماندەی هیزی حەمرین بو لە بادینان. حەسۆ میرخان دولەمەری بە سەختی بریندار بو بەلام دەرباز بو. حەسۆ ژاژوکی سالیک بو بە دوامانەوە بو لە کوزلان نشەبوەوە. بە زستان جاسوسانی لی گرتین و هیزی ئیرانی هینایە سەرمان و، بە هاوین قەندیلی لی گرت بوین. لە سەر کانیەکەی کونەکوتر کوژرا بو، هەگبەیەکی لی بە جی مابو، یادداشتەکانی خوی و هەندی نامەی ئیدریس و مەسعود و، کەسانی تری تی دا بو. چەند پاسداریکی ئیرانیشی لە گەل کوژرا بو.

لە یەکیتی یش دو لە فەرماندە ئازاکانی کوژران: ئەحمەد مەولود، فەرماندەی تیپی کاروخ، بەیانی زو لە پەلاماردانی بیبیدا. ناظمی حەمەی سلیمان، فەرماندەی تیپی خالخالان، لە دوای نیوەرودا لە راونانی شکستەی هیزەکەدا لە نزیک بولی.

بە دریژایی روژ هالیکوپتەری عیراقی چاودیری مەیدانی شەرەکانی ئەکرد و، چاروبار ریزیکی کویرانەی بە سەردا ئەتەقاندین.

*

من هیشتا لە بیبە بوم مەحمودی حەمە بور گەیشتە سەر شاخ. مەحمود زو زو ئەهات بو لام و نامەی ئەم و ئەوی بو ئەهینام، بەلام ئەمجارە پیم سەیر بو لەم کاتەدا هات بو. دەمەو ئیوارە هەمو شت تەواو بو دابەزینەوە بو بنکەکەی زارگەلی. مەحمود کوریکی لە سلیمانیەوە لە گەل خوی هینا بو داوای پارەیان لی کرد بو، ئەیویست بیبەخشن.

من کەوتمە ئامادە کردنی چەند وتاری بو رادیو، کادریکی راگەیاندنی مەلبەندیشم لە لا بو، باسەکانی هەموی تایپ کرد و، نامیلکەیەکی دریژی لی دەرچو چاپ و بلاو کرایەوە. ریپورتاجیکی دریژی لە سەر شەرەکان و، یادداشتەکانی حەسۆ و، نامەکانی ئیدریس و مەسعود و، ناوی کوژراوەکان تی دایە.

*

عەرەب و ئیسرائیل چەند جاری تەرمی کوژراوەکانیان ئەگوریەوە و، چەند جاری کوژراوی ئیسرائیلی کە ئەکەوتە لای عەرەب لە گەل گیراوی زیندوی عەرەب دا ئەیانگورینەوە. منیش ویستم چاو لەوان بکەم. لە گەل پیشمەرگەکان قسەم کرد، وتم: چەند جار ئەوان لە هەورامان و لە هەکاری پیشمەرگەی ئیمەیان کوشتوە و، نەیانهیشتوە کەسوکاریان تەرمەکانیان وەربگرنەوە. ئیوەش لاشەکانی ئەمان بشارنەوە بەلکو «جەنازە بەرامبەر بە جەنازە» پییان بگورینەوە. قەندیل پەنا و پەسیری زورە. پیشمەرگەکان ئەوەندە رقیان لە حەسۆ و تاقمەکەی بو، زور زو تەرمەکانیان لە کون و پەنا و پەسیوی شاخەکە دا شاردەوە. حەسۆ ئەو زەمانەی کە فەرماندەی هیزی کاوە بو لە پشدەر ژنیکی لە خەلکی ئەو

ناوچەیە هینا بو. خەزوورەکەی و هەندێ لە کەسوکاریان هات بوون تەرمەکەی ببەنەوە. منیش پێم وتن: «خێزانەکانی، عەلی عەسکەری و خالید سەعید و شێخ حسێن چەند ساڵە بە تاواتەوەن شوێنی گۆڕەکانیان بزانن. کەی شوێنی گۆڕەکانی ئەوانتان بۆ دۆزینەوە ئێمەش شوێنی تەرمەکانتان پیشان ئەدەین!»

*

## عەلی پچکۆل و چا

خواردنمان خراپ بو، پارەمان کەم بو، یەکدوورۆژ بو چامان لێ برا بو. عەلی پچکۆل چەند جارێ داوای کرد: هێزەکان ئێزن بدەین، من جارێ مانەوەیانم بە پێویست ئەزانی تا دڵنیا ئەبوم لە کشانەوەی یەکجاریی هێزەکانی جود. عەلی ڕۆژێک نامەیەکی بۆ نوسی بوم، ئەلێ پێشمەرگەکان ٣ ڕوژە چایان نەخواردۆتەوە، سەریان ژان ئەکا ناتوانن ئەرکەکانیان بە جێ بهێنن، ئەگەر چامان بۆ نەنێری، پلاوی لێ ئەکەین. منیش بۆم نوسی: من مەسئولی عەسکەری جەبهەکەم نەک مەسئولی چا. نابێ پێشمەرگەکان، لە بەر نەبونی چایێ، ئێزن بدا. لە سەر ئەمە تورە بوبو، خۆی و مەفرەزەکەی لێیان دا بو گەڕابونەوە بۆ ناوچەی چەمی ڕیزان.

*

مەکتەبی سیاسی بە بۆنەی ئەم شەڕەوە بەیانێکی دەرکرد. لە بەیانەکەدا لایەنەکانی جودی بانگ کرد بو بۆ چارەسەرکردنی سیاسی کێشەکان و بۆ ئاشتبونەوە. ئاگاداری نوسەرەکانی ڕادیومان کرد بو زنجیرەیەک وتار بەم مەعنایە بنوسن. ڕادیوی پارتی بە جنێو وەڵامی ئەدایەوە و، هەڕەشەی ئەکرد. منیش بە بێتەل قسەم لە گەڵ یەکێکیان کرد و داوام لێ کرد تەعلیقێکیان لە سەر بنوسێ بە ناونیشانی: «ڕەنگۆ تەفاهوم ناکا» ئەم عینوانە لە هەمو وتارەکانی کە زیاتر وروژاندنی بۆ جنێودان.

*

هێزەکانی جود ئاوا بون بۆ ئێران و، تا چەند ساڵی ئێتر وازیان لە گەڕانەوەی بە کۆمەڵ و لەشکرکێشی هێنا.

*

کە هێزەکانی جود لە کوردستانی عێراق دەرکران، دانیشتوانی دێهات لە یەکێتی زیاتریان پێ خۆش بو، نەک لە بەر ئەوەی یەکێتییان لە هەمویان خۆشتر ئەویست، بەڵکو لە بەر ئەوەی ئەرکی ٤ حزبیان لە کۆڵ بوەوە، تەنیا هی یەکێکیانی لە سەر مابو.

*

## گیرانی بارزانیەکان

ئەو کاتەی ناوچەی حاجی هۆمەران بو بو بە مەیدانی گەرمی جەنگی عێراق - ئێران. بنەماڵەی بارزانی و سەرانی پدک بە ئاشکرا هاوکارییان لە گەڵ هێزەکانی ئێران ئەکرد دژی جەیشی عێراقی. کۆکردنەوەی دەنگوباسی عێراق و هێزەکانی و، چاوساغی و ڕێبەری هێزەکانی ئێران و، و هێنان و بردنی دیدەوانی تۆپخانەی ئێرانی ئەمە بەشێکی کەمی ئەو هاوکارییە ئاشکرایە بو. لە هێرشەکانیش دا ئەوان وەکو هێزی پارمەتیدەر و خەریککەر و لێدانی پشتەوە بەشدار ئەبون.

پێش لە هێرشەکانی ئێران بۆ حاجی هۆمەران، بەعس وەکو لە گەڵ یەکێتی دەستی

بە پەیوەندی و ئالوگۆڕی بیروڕا کرد بو، لە گەڵ بنەماڵەی بارزانی یش دا هەمان کاری دەس پی کرد بو. لە بەر ئەوەی ئەوان لە ناو تیهران دا دانیشت بون و، ئاشکرا کردنی پەیوەندی لە گەڵ عیراق، ئەبو بە هۆی غەزەبی تیهران، ئەمەیان شارد بوەوە. لەو کۆبونەوەیەدا کە لە - ناوزەنگ لە نێوان نوێنەرانی یەکێتی و نوێنەرانی حکومەت دا کرا، ئەبو ئەحمەد (عقید رکن خلیل محمد شاکر) جێگری سەرۆکی ئەوسای دەزگای موخابەرات بارزان تکریتی، بە راشکاوی دانی پەوەدا نا کە لە گەڵ بنەماڵەی بارزانی هەمان پەیوەندی و ئالوگۆری بیروڕایان کردوە.

بەشدار بونی بنەماڵەی بارزانی و هێزەکانیان لە هێرشەکانی ناوچەی حاجی هۆمەران دا، لە لای سەددام جگە لەوەی بە خیانەتی نیشتمانیی دائەنرا، بۆ خۆیشی بە خیانەت و دەسبڕین و فێل لی کردن ئەژمارد. بارزانییەکانی لە عیراق مابونەوە لە ئۆردوگای بەحرکە و قوشتەپەدا کۆ کرا بونەوە. زۆری پیاوەکانیان بو بون بە چەکهەڵگری «جەیشی شەعبی» و بە دڵسۆزی ئەرکەکانی خۆیان بە جی ئەهێنا.

شیخ عوسمانی کوری شیخ ئەحمەد و عیماد و ئەدهەمی کوری بوبون بە بەعسی. عیماد سکرتێری مەجلیسی تشریعی بو. عوبەید و لوقمان و صابیر لە بەغدا دانیشت بون. عوبەید بۆ شکاندنی باوکی ماوەیەک لە وەزارەتی بەعسییەکان دا بو بە وەزیری دەولەت. داوودەزگاکانی بەعس لە راپورت و نوسینەکانیان دا بە بنەماڵەی بارزانیان ئەوت: «سلیلی الخیانە».

سەددام بۆ ئەوەی تۆڵە لە بنەماڵەی بارزانی بکاتەوە، هێزێکی حەرەسی جمهوری لە بەغداوە نارد دەوری ئۆردوگاکانی قوشتەپە و بەحرکەیان گرت. هەر پیاوێکی بارزانییان بەردەس کەوت لە گەنج و پیر هەموویان گرتن. شیخ عوسمان و کورەکانی و، کورەکانی مەلا مستەفا: عوبەید و لوقمان و صابیریان چنیەوە. سەر و سۆراخیان نەما. دوای گرتنیان بە ماوەیەکی کورت سەددام لە یەکی لە وتارەکانی دا لە تەلەفزیون دا وتی: ئەوانە خیانەتیان کردوە لە بەر ئەوە: «ارسلناهم الی الجحیم». وا باو بو کە مەسعود و ئیدریس، هاوزەمان لە گەڵ هێرشەکانی ئیران دا بۆ حاجی هۆمەران، هەواڵیان بۆ بارزانییەکان ناردوە خۆیان ئامادە بکەن بۆ چەک هەڵگرتن و گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی سنور.

لەو کاتەدا کە بەعس ئەم تاوانە گەورەیەی بەرامبەر بە بارزانییەکان کرد من لە خەتی بوم. رۆژێکیان کورێکی بارزانییان هێنا بۆ لام ناوی عەبدولباقی بو. باسی کارەساتەکەی بۆ گیرامەوە. لە یەکێتی دڵنیا نەبو، چونکە تازە شەڕەکانی قەندیل بوبو وای ئەزانی ئیمە رقمان لە هەمو بارزانییەکە. دوای ئەوەی لە گەڵ مامجەلال قسەم کرد عەبدولباقیم بینیەوە و لە زمانی سەرکردایەتی یەکێتییەوە پیم راگەیاند: «ئەگەر ئەیانەوی بڕۆن بۆ تیهران ئیمە هەمو کارئاسانیەکیان بۆ ئەکەین بۆ رەوانە کردنیان. ئەگەر لە کوردستان و لە شوێنەکانی خۆیان ئەمێننەوە هەر یارمەتییەکیان لە ئیمە بوێ بە پی ی توانا پێشکەشیان ئەکەین. هەر کەسێکیشیان ئەیەوی لە گەڵ یەکێتی بێ بە پێشمەرگە بەخێرهاتنی ئەکەین». عەبدولباقی گەڕایەوە هەولێر و لە گەڵ هەندی لەوانەی مابون قسەی کرد، دیسان هاتەوە لامان و بڕیاری دابو بێ بە پێشمەرگە. ناردم بۆ لای مامجەلال. مامجەلال دڵنەوایی زۆری کرد بو. عەبدولباقی بو بە پێشمەرگە و کرا بە فەرماندەی کەرت. کورێکی دڵسۆز و وریا بو.

جارێکیان یەکی لە بارزانییەکان وتی کوشتنی ئەوانە بە تایبەتی شیخ عوسمان و

کوڕەکانی مەلا مستەفا وەکو بیتاقە وابو بۆ مەسعود دەرچی. بەعسییەکان بەم کارە
سەرۆکایەتی عەشیرەتی بارزانیان بە تەنیا بۆ مەسعود هێشتەوە بە تایبەتی کە ئیدریس
مرد. لە ناو کوڕەکانی مەلا مستەفادا کەس نەما بو مونافەسەی بکا و، وەکو عەشیرەتەکانی
تر ئەمانیش پارچە پارچە بن و، هەر کوڕێک چەند تیرە و تایفەیەک بە لای خۆی دا
رابکێشی. ئەوانەی مابون هەمویان لە دایکی خۆی و، لە خۆی منالتر بون.

*

## بەرەو ئاسۆس

هەلومەرجی کوردستان زۆر ئالۆزا بو. نەمانئەتوانی هەمو ئەندامانی سەرکردایەتی،
یاخود مەکتەبی سیاسی پێکەوە لە یەک شوێن کۆ بینەوە، ئەبو دابەش بین. لە لایەکەوە
بۆ سەلامەتی خۆمان وا باش بو، لە لایەکی ترەوە بۆ ئەوەی لە نزیکەوە خۆمان سەرپەرشتی
کارەکان بکەین. من لە مێژ بو بڕیارم دابو بچم بۆ بەری مەرگە.

کە ناوەزەنگیان بە یەکجاری چۆڵ کرد، مولازم عومەر چو بو بۆ کانی کەنێر لە
پشتی کانی تو لە بەری مەرگە، ماوەیەک بو هات بوە دۆڵی بالیسان، بڕیارمان دا پێکەوە
بگەڕێینەوە. ئاوات قارەمانی بەش بانگ کرا بو بۆ لێپرسینەوە و ڕێگای درابو بگەڕێتەوە
شارباژێر، ئەویش تێکەلاوی کاروانەکەی ئێمە بو.

هێزەکمان بە ئۆتۆمۆبیل بەرەو بناری هەوری بە ڕێ خست.

چوینە سکتـان. دێ یەکی گەورە بو بەلام بە هۆی دوژمنایەتی ناوخۆییانەوە
گوندەکەیان ویران بوبو، چەند کەسێکیان لە یەکتری کوشت بو. لە ڕقی یەکتری هەر
لایەکیان چو بو لە لای یەکێکی دەسەلاتدار بوبو بە جاش.

شەو بە لای مەعسکەری هێزوپ دا ڕەت ئەبوین ئۆتۆمۆبیلێک لە سەر جادەکە
لایتەکانی لە ئێمەی ئەدا ڕێچکەکەمان لەو شەوە تاریکەدا بەرچاو ئەکەوت. هەمو خۆمان دا
بە ئەرزدا بۆ ئەوەی نەیبینرێین. لە کابرای شوفێرمان خوری لایتەکەی بکوژێنێتەوە.
شوفێرەکە پەشۆکا بو نەیئەزانی چی بکا. شتێکی چاوەڕێ نەکراو بو لەم شوێنەدا توشی
پێشمەرگە بێ. هەرچۆنێ بو ئۆتۆمۆبیلەکە ڕۆیشت. ئێمە هێشتا خۆمان دا بو بە ئەرزا لە
ناو ئێمەوە بڵێسەیەکی گەورە بەرز بوەوە و گرمەیەکی گەورە هات. لە ڕیزەکەدا عومەر لە
پێش منەوە بو. بە دەم ڕێگاوە قسەمان ئەکرد. ماوەیەک بو تۆزا بو. زۆر ئەترسام شتێکی
لێ هات بێ. لە ناو هەمویان دا خەمی ئەوم بو یەکسەر وتم: «کاک عومەر سەلامەتی؟»
وتی: «سەلامەتم!» ئەگەر شتێکی بە سەر بهاتایە ناحەز و دوژمن ئەیانوت: پیلانی خۆیان
بوە. سەرەتا وامانزانی هاوەنی مەعسکەرەکەیە. کەوتینەوە ڕێ چوینە داری قەستەران. تا
ئەوسا کەس خۆی نەکرد بو بە خاوەنی. دەرکەوت پێشمەرگەیەکی دەستەکەی ئاوات
ئاربیجیەکەی لە سەر پێ بوە، لە شلەژاوی دا لە دەستی دەرچوە. کەللە سەری
پێشمەرگەیەکی بریندار کرد بو.

ناوچەکە بە ڕەبیە و مەعسکەر تەنرا بو نەمانئەتوانی بمێنینەوە. شەو چوینە گوندی
مێرۆژە لە بناری کۆسرەت و، ڕۆژەکەیشی هەر لەوێ ماینەوە، بۆ عەسرەکەی چوینە ئالیقە.
پێشتر چەند بەلەمێکیان بۆ ئامادە کرد بوین. لە تاریکایی شەودا بە بەلەم لە ناوی
ئەستێلی دوکان پەڕینەوە بۆ بەری مەرگە. لە کەناری ئاودکە و لە کەلکی مەرگە پێشمەرگە

چاوەڕییان ئەکردین. هەر ئەو شەوە چوینە ئاوەژێ. جەیش بە پەرینەوەی ئیمەی زانی بو، ڕۆژی دوایی هالیکوپتەر پەلاماری پەلەمی ماسیگرەکانی دا زۆری سوتاند.

*

چیای ئاسۆس لەوەڕگایەکی دەولەمەندە بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵ و، گیا و پوشی زۆری هەیە، بەلام ئاوی کەمە، چینی بەردەکانی ئەستورنیە. لە بەرزاییەکانی دا تەنیا چالبەفری لی یە، هاوینان دەری ئەهینن و ئەیتوێننەوە. هەندی جیگا «ماقوژ» لی یە. لە قەرەچوخ بە ماقوژ ئەڵین «هەرکەو». ماقوژ ئەو ئاوەیە کە لە چالایی سەر بەردا ئەمێنیتەوە. کەو و کیوی لە هاوین دا لی ی ئەخۆنەوە. «گادەر» و «کوڕیس» لە لوتکە بەرزەکانیتی. بە مەڕی گوێ شۆڕ ئەڵین: «کوڕیس»، بەلام ناوی «گادەر» لە چەند جیگای تریش هەیە: ناوە بۆ شاخ و، ناوە بۆ ئەو ڕوبارەی کە لە سەر سنوری عیراق - ئیران هەلئەقولی و بەرەو شنۆ ئەکشێ. تاک و تەرا بزنە کیوی لی ما بو. وەکو ئەیانوت سەردەمی زو پلنگی لی بینراوە.

*

بەری مەرگە

بنگرد، ناوەندی ناوچەکە بو، بنکەی ناحیەی لی بو. ئوردوگایەکی گەورەشی لی کرا بوەوە نزیکەی ٤ هەزار مالی تی دا بو.

ناحیەی بنگرد پیک هات بو:

گوندەکانی بناری ئاسۆس: ویسی، بیخری، بیترخی، بیانە، دولە گزم، سەرتەنگ، نیزۆکی، خانەلی، کانی هەنجیر، سەرچیا.. ڕاگویزرا بون و، گەرمکان، ناودەشت، کەلەکان، بناویلی ئاوەدان بون.

گوندەکانی بەری مەرگە: کانی تو، چنارنێ، ئاوەژێ، هەوارەبەرزە، خورخورە، باخیان، گزمەزەل ڕاگویزرابون، لزتەر، هەلزنە، نزلچکە، سزفیان، مەرگە، پاشکیش، مەلا سەفی، بیوەکە، بیگمی، شارستین، دولە بی، سیدەر ئاوەدان بون.

هەردو دیوی ئاسۆس گوندە ئاوەدان و ڕاگویزراوەکانی لە ژیر دەستی پیشمەرگە دا بو، بەلام گوندەکانی: کویرەکانی، هەنجیرە، بنگرد، خۆشاو، بیموشە، بەردەشان، سیوکان، سیناجیان، قەرەتەپە، دیبیژە، مەمەنداوا، بەردەکۆز، سەرسیان کە هەندیکیان لە سەر جادە و، هەندیکیان لە لیواری ئەستیلەکەی دوکان دا بون، لە ژیر دەسەلاتی بەعس دا بون.

هەندی لە خەلکی شوینە ڕاگویزراوەکان لە ناوچەکە دورخرابونەوە بۆ ئوردوگای تەکی لە سەر ریگای چەمچەمال.

لە ڕوی پیکهاتنی خیلەکییەوە ناوچەکە تیکەلاو بو لە: شیلانە، جاف و ترکە ڕەشە.

ترکە ڕەشە تیرەیەکی پچوک بون لە سەرسیان و بەردەکۆز دائەنیشتن.

شیلانە، ٣ تیرە بون:

پیرە، کە لە گوندەکانی بیموشە و هەلزنە و، هەندیکیشیان دوای ژیرئاوکەوتنی گوندەکانیان چوبونە چوارقورنە، ژاراوە، ڕانیە، ئەسکی کەلەک.

شرانە، لە گوندەکانی بنگرد، سزفیان، سەرچیا، هەندیکیشیان دوای ژیرئاوکەوتنی گوندەکانیان لە سولتانەدی و ژاراوە دائەنیشتن.

رەجەب، یا ئالی (ئالی کوری رەجەب بوە)، ئەمانیش لە بەردەشان و، هەندێکیشیان دوای ژێرئاوکەوتنی گوندەکانیان لە بازیان دائەنیشتن.

گوندەکانی: خورنەورە، باخیان، گۆمەزەڵ، دۆلەبی، شارستێن، سیدەر، کویرە کانی و هەنجیرە بەشێ بون لە ناوچەی جافەتی.

*

ناوچەکە چەند گوندێکی تێ دایە ئەهێنی لە ئاستی دا راوەستی، لەوانە: مەرگە، بەردەشان، کانی تو.

– مەرگە، کانی و ئاوی زور و، ئەرزی فراوانی چاندنی دانەویلە و، باخی هەنجیری هەیە. چوار مزگەوتی تێ دابو: مزگەوتی کانی چاوان، کانی سەردەشت، گەرمک و جافان. مزگەوتەکان بە ناوی کانیەکانەوە ناو نرا بون. چەند گۆرستانێکی نزیکە. هەندێکیان گەورەن و، کێلی گۆرەکانیان بەرز و ئەستور و، هەندێکیان نیگاری شمشێر و خەنجەر و مەلیان لە سەر بو. کێلە کۆنەکانی هیچ نوسینێکیان لە سەر نیە. پێ ئەچێ مەرگە لە کۆنەوە ئاوەدان بوبێ. ئەم گۆرستانانە ئەهێنی لێکۆڵینەوەی مێژوییان لە سەر بکرێ. دانیشتوانی ناوچەکە هەندێ روداوی دەماودەم ئەگێرنەوە کە لە سەردەمی هاتنی لەشکری ئیسلام دا مەرگە پایتەختی قەراڵێکی گەورە بوە و، دوای شەری قورس و خویناوی ئینجا ناوچەکە گیراوە و، بە شمشێر ئیسلامیان کردون. پشدەرییەکان بە مەرگەییەکان ئەڵێن: «مەرگەیی ئەسحابەکوژا». مەزاری «پیرۆتە سوری مەرگەیی» کە لە ناوچەکەدا بە شوێنێکی پیرۆز دائەنرێ کەوت بوە دامێنی گەورە قەڵا و پشتی مەرگەوە. ئەوسا «رەبیە» یەکێ گەورەی جەیشی لێ بو. گوایە پیرۆتە سور لە گەڵ هاتنی ئیسلام دا موسوڵمان بوە و، لە شەرێکی دینیی دا کوژراوە و لەوێ ناشتویانە. گێرانەوەکان ئەفسانەن، پشت ئەستور نین بە هیچ بەڵگەیەکی مێژویی.

ئەوسا ناوەندی قەزاکەیان گواستۆتەوە بۆ قەلادزە. مەرگە سەردەمێک بنکەی ئەمارەتی بابان بوە. بە پێ ی «بەیتی کاکە شێخ و کاکە میر»، هەندێ لە میرەکانی بابان لەوانە ئەم دو میرەی بەیتەکەیان بە سەردا هەڵدراوە، لە ئەنجامی زورداری و بەدرەوشتی دا، بە دەستی مەرگەییان بە کۆمەڵ کوژراون. تا ساڵی ۱۸۹۳ مەرگە ناوەندی قەزای پشدەر بوە.

وەکو ئەیانوت: مەرگە و لۆتەر و هەندێ گوندی تری ناوچەکە دوپشکی کوشندەیان هەبو. تا من لەوێ بوم چەند جاری دوپشک بە پێشمەرگە و خەلکی کەوەی دا، بەلام کەسی نەکوشت.

کاتی خۆی مەرگە ناوەندی بەرێوەبەرایەتی ناوچەکە بوە، هەر بۆیە بە هەمو ناوچەکە ئەوترێ: «بەری مەرگە».

*

– بەردەشان گوندێکە کاتی خۆی سەر بە مەرگە و دواییتر سەر بە بنگرد بوە. یەکێ لە بە ناوبانگترین بەیتبێژەکانی کورد: عەلی بەردەشانی، لەم دێ یەدا لە دایک بوە. حاجی قادری کۆیی لە باسی شاعیرەکانی کوردستان دا بەمجۆرە ستایشی کردوە:

دو عەلین وەکو حەسسان
حەریر و بەردەشانە مەسکەنیان

له دو عەلی، مەبەستی: عەلی حەریری و عەلی بەردشانی و، له حەسسان
مەبەستی: حسان کوری ثابتە. حەسسان شاعیرێکی عەرەبی گەورەی سەردەمی جاهیلی
بوە، دوای ئیسلام بە ستایشی پێغەمبەر ناوی دەرکردوە.

ژمارەیەکی زور بەیت، چیرۆک، گۆرانی، قسەی نەستەق.. بە سەر زمانی
خەلکەوەیە، ئەدرێتە پالی، کە هەموی نیشانەی بلیمەتی ئەون. کەچی سەرگورشتەی ژیانی
خۆی رون نیە و، بابەتەکانی کەمێکی نەبێ، کە لەم سالانەی دوایی دا تۆمار کراون، ئەوی
تری نەنوسراوەتەوە، بەلام بەوەدا کە یەکێ لە بەیتەکانی بۆ ئەورەحمان پاشای بابان وتوە،
دیارە هاوچەرخی ئەو بوە.

بەردشان مەرکەزی عەشیرەتی شیلانە بو.

رەسول مامەند لە بەردشان لە دایک بوە. کە من لە ئاوەژێ نیشتەجێ بوم، کوێخا
پەروێزی برای رەسول، یەکێکی ناردە لامان بۆ بەخێرهێنان. بێگومان ئەمەی لە پیاوەتی
خۆی بو، چونکە هیچ ئیشێکی بە ئێمە نەبو، جگە لەوەش ئێمە لەو کاتەدا لە گەل حسک
ناکۆک بوین.

*

- کانی تو کەوتۆتە بناری شاخەوە لە کۆتایی دۆلێک دایە لایەکی ئاسۆس و،
لایەکی شاخی چل بزنەیە. هەوای خۆش و دیمەنی جوان و، چەند کانیەکی سارد و
سازگاری تێ دایە، دوانیان لە بەرزایی هەلئەقولێن و ئەرژێنە قولایی دۆلەکەوە. زستان
بەفرێکی زوری لێ ئەباری.

زەویوزاری کشتوکال و دانەویلەیان کەمە، ئەرزەکانیان بە دەس بەردەبڕ و چاک
کراوە. رەزی تری و باخی میوە و ترشیان زورە. پیاو ئەبینێ پشتاوپشتی خەلکی ئەم دێ
بە چەندە رەنجیان لە گەل باخەکانیان داوە. میوەیەکی لێ بو، وەکو هەلوژە رەشە بەلام
پچوکتر و تامیشی خۆشتر، پێیان ئەوت: «سیکەرژ».

ئاژەلداری ئەکەن. هەوای ناوچەکە بۆ پەروەردە کردنی ئاژەل، بە تایبەتی بۆ راگرتنی
بزنە مەرەز، لە بارە.

دانیشتوانی ناوچەکە لە کۆنەوە شارەزاییەکی زوریان هەیە لە تەونکەری دا، ئافرەت
لە تەشی رستن و بەرهەمهێنانی داوی بارێک دا و، پیاو لە چنینی بەرز دا. شالی کانی تو
و چنارنی بۆ تەنکی و سفتی و جوانی بە ناوبانگە.

کانی تو و کانی کورکور ئەشی بکرێن بە شوێنێکی تورێستی خۆش. بە هاوین بۆ
سەیران و بە زستان بۆ یاری سەربەفر.

*

ئەم ناوچەیەش وەکو خۆشناوەتی و، زۆر ناوچەی تری کوردستان بزن راتەگرن. بزن
لە مەڕ هەرزانترە، بە خێوکردنی ئاسانترە، زۆرتر بەرگەی نەخۆشیی و سەختیەکانی
سروشت ئەگری.

لە کوردستان ۳ جۆر بزن هەیە: بزنی رەش، بزنی مەرەز، بزنی کێوی.
بەچکەی بزن: کار یا کارژۆلە (لە بونەوە تا تەمەنی ئەبێ بە ۳ مانگ)، گیسک
(لە ۳ مانگیەوە تا ئەبێ بە ۱ سال)، چتیر (لە ۱ سالیەوە تا ئەبێ بە ۲ سال)، ئینجا بە
نێرەکانی ئەوترێ: نێرێ، سابرێن، تەگە و بە مێ یەکانی: بزن.

کار تا لە خەم ئەرەخسی لە «کنزز» دا پەروەردە ئەکری. کنز بە «تەیمان» چوار دەوری ئەگیری، بزن لە زستان دا ئەکریتە «پشتیر» یا «هۆڵ» ەوە.

ئەو ساڵەی بزن نەزێ، شیریشی نابێ، بزنی بێ شیر پێ ی ئەڵێن: «قسر».

بزنی ڕەش و بزنی مەرەز لە گەڵ نێرینی یەکتری جوت ئەگرن، بەچکەکەیان «دوورە، یا دوورەگ» دەرئەچی.

مووی بزنی ڕەش، زبر و ڕەقە بۆ دروستکردنی جلوبەرگ بە کەڵک نایەت، بەڵام گوریس، ڕەشماڵ، ڕەشکە، جەواڵ، تەڕ، خەرار..ی، لی دروست ئەکری.

مووی بزنی مەرەز، ڕەنگی جۆراوجۆری جوانی ڕەش، سپی، خورمایی، شینکی.. هەیە و، نەرم و خاوە، بۆزو (کر، شاڵ)، بەرماڵ، پۆیەشمین، جاجم، گۆرەوی، پۆزەوانە، دەسکێش، پلۆز و، لە هەندی شوێن بەتانی.. لی دروست ئەکری.

بزنی ڕەش بەرگەی سەختی سروشت ئەگری و، لە شاخەوانی دا وریا و سوکەڵەیە، بەڵام زەرەری گەورە لە جەنگەڵ و باخ ئەدا، چونکە چڕۆی تازە پێگەیشتووی درەخت ئەخوا و، تویکڵی قەدەکەی ئەکرێنێتەوە، دارەکە وشک ئەبێ. لە بەر ئەوە پێ ی ئەڵێن: «کوللەی ڕەش».

پەندی زۆر لە سەر بزن هەیە، وەکو: «بزن بۆ شەوی جێ ی خۆش ئەکا»، هەروەها: «بزن ئەجەلی بێ نانی شوان ئەخوا»، هەروەها: «خوا هەقی بزنی کوڵ بە سەر بزنی شاخدارەوە ناهێلی»، هەروەها: «گیا ئەوەیە بە دەمی بزن خۆش بێ»، هەروەها: «نەمخواردم و نەکردم، گیسکێ جرینگاندم».

بۆ یەکێ کە زو زو بکەوێتە خۆشیەوە ئەڵێن: «وەکو بزنی دیلپژە ساڵی دو بەهار ئەخوا». بۆ یەکێ بەڵێنەکانی بە جێ نەهێنێ ئەڵێن: «وەکو بزن وایە دەستنوێژ هەڵناگری». بۆ یەکی هەموو جاری لە دوای خۆشیەک ناخۆشیەکی بە سەر بێ، ئەڵێن: «وەکو گیسکەکەی هەباسی خاسی لی هاتوا»

*

بارەگای تیپی ئاسۆس لە ئاوەژی و کەرتەکانی بە درێژایی بناری ئاسۆس بڵاو بوبونەوە.

بارەگای تیپی ٦٨ ی مامەندە لە لۆتەر و، کەرتەکانی لە بناری ئاسۆس بە دێوی پشدەردا دابەش بوبون.

بارەگای تیپی ٤٤ ی چەکوچ لە گەرمکان و، بارەگای تیپی ٤١ ی کورەکاژاو لە کەڵەکان بو. ئەم دو تیپە لە چاو ئەوانی کەدا بە ژمارە کەمتر بون.

هەندی لە کەرتەکانی تیپی ٦١ ی جوتیارانیش، بە هۆی شەڕەکانی عێراق - ئێرانەوە، پەری بونەوە بەری ئاسۆس هەندێکیان لە کانی تو بارەگایان دانا بو. ئەم هێزانە هەموویان سەر بە مەڵبەندی دو بون کە بارەگاکەی لە سەرگەڵو بو.

کاکەمین قادر بەرپرسی کەرتی ڕێکخستنی قەڵادزە لە چنارتی بو.

کە گەیشتینە ناوچەکە، تازە خەریکی ئاواکردنەوەی گوندە وێرانکراوەکانی بون، لە بەر ئەوە شوێنێکی ئەوتۆی ئامادەی لی نەبو بیکەین بە بارەگا، ئەبو خۆمان خانو دروست بکەین. پێشمەرگەکان لە ئاوەژی و مەرگە جێگەی کاتییان پەیدا کرد و، منیش چەند ڕۆژی لە ماڵی عەبدولڕەحیم بوم لە ئاوەژی.

ئاوەژی گوندێکی بچوک بو. پشتی داوێ بە ئاسۆسەوە روی لە قەرەسرد بو. چەند کانی و کارێزێکیان هەبو، بەلام زەویوزاری کشتوکاڵیان کەم و لێژ و، بەرداوی بو. نزیکەی ۲ ماڵێکیان لە تەکیەوە هات بونەوە بنەیان دانا بو. رەزی تری و ترش و باخەکانیان وشک بوبو، تازە خەریکی ژیاندنەوەی بون. ژمارەیەکی کەم بزنی سەرمز و بزنی رەش و گاوگۆتاڵیان پەیدا کرد بو. دانیشتوانی ئاوەژی کەم دەرامەت و، ژیانێکی هەژارانەیان هەبو، بەلام تەبیعەتیان دەوڵەمەند و نەفسیان بەرز و، لە میوانداری دا دڵ و دەرون فراوان بون. هەر لە ئاوەژی ماڵی کامەرانی بەهجەتی عەونی، زێوزی عەبدوللا رەوی، ئەحمەدی حاجی محەمەدی قەرەتەپە، حەمەی حەمەباقی.. لێ بو.

خەلکی ناوچەکە بە گشتی پێیان خۆش بو، ئێمە لەوێ جێگیر ببین، لایان وابو تیتر هێزەکانی جەیش ناتوانی بە ئاسانی بێتە سەریان و، جارێکی تر رایان بکوێزی.

مام ئەحمەد

مام ئەحمەد لە سەرەتای دەس پێ کردنەوەی شۆرشەوە بوبو بە پێشمەرگە. زۆرجار کە لە قسەکردن دا ناوی یەکێکی لە بیر بچوایە «وانیک» ی بە کار ئەهێنا بە پاسەر عەرەفاتی ئەوت: وانیک عەرەفات و، بە ئاسملوی ئەوت: وانیکلو.. لە بەر ئەوە ناویان نا بو مام ئەحمەد وانیک، ئەگەرچی لە بنەماڵەیەکی ناسراوی خەلکی ناوچەکە بو، بەلام پێشمەرگە و خەلک هەر بەم ناوەوە ئەیانناسی.

دوای ئەوەی رێگای مەرگە - بەرگەلو کرایەوە تراکتور و ئوتومبێل هاتوچۆی پێ دا بکەن. رۆژێکیان دلێر بە ئوتومبێل هات بو بۆ ئاوەژی. مام ئەحمەد ئەیویست بروا بۆ بەرگەلو. بە دلێری وت بو: «کە رویشتی منیش لە گەڵ خۆت بەدا» دلێر وت بوی: «باشە، بەلام من زو زو شتم لە بیر ئەچی بۆ ئەوەی لە بیرم نەچی لە سەعات ئەوەندەوە لە سەر رێگاکە چاوەری بکە کە هاتم سوارت ئەکەم» مام ئەحمەد وای زانی بو نایەوی سواری بکا. وت بوی: «ئەگەر ئەوەندە زو زو شتت لە بیر ئەچی ئەوە بۆچی رۆژی لە بیرت ناچی لە باتی بەرگەلو بچی بۆ بنگرد؟» بنگرد ئەوسا هێزەکانی حکومەتی لێ بو.

خاڵە مین

خاڵەمین، یەکی لە پیاوە ریش سپیەکانیان ئاوەژی، ژورێکی لە دو ژورەکەی ماڵی خۆیان بۆ من تەرخان کرد. بە درێژایی ٦ مانگی رابوردو، بە هۆی گەران و سوران و شەروشۆرەوە، لە هاوسەرەکەم دابرا بوم. ئاردم بە دوای دا ئەویش هات لەوێ نیشتەجێ بوین. تا خانوەکەی خۆم تەواو بو، چەند حەفتەیەک میوانی ئەو بوین. ئەو ماوەیە تێکەڵاویمان زۆرتر و دۆستایەتیمان بە هێزتر بو. خاڵەمین خۆی نمونەی پیاوی جوامێر و، هاوسەرەکەی نمونەی خانمی خانەدان و، منالەکانی نمونەی مرۆڤی بەرز بون.

مام باپیر

مام باپیر، یەکێکی کە لە پیاوە ریش سپیەکانی ئاوەژی، کانیەک و پارچەیەک ئەرزی دامی ماڵ و بارەگای لە سەر دروست بکەم. شوێنەکە ناوی «کوروان» بو نزیکی ئاوەژی بو. مام باپیر پیاوێکی ژیر و بەرێز، شارەزای کاروباری عەشایر و قسە خۆش بو. حەمەی کوریشی بە دڵسۆزیەکی بێ ئەندازەوە کاروباری هێنان و بردنی بەرید و پێویستیەکانی تری ئەنجام ئەدا.

خاڵە مین و مام باپیر خاڵ و خوارزا بون و، هەردوکیان باوکیان لە شۆرشی شێخ

مەحمودا لە سەرەتای سییەکان دا کوژرا بو، خۆیشیان لە شۆرشی ئەیلول دا پێشمەرگایەتییان کردبو، بەلام دانویان بە یەکەوە نەئەکولا.

*

خانو دروست کردن لێرە کارێکی زەحمەت نەبو. جادەی قیر بۆ ناوچەکە راکێشرا بو، ئەمانتوانی کەرەستەی خانو دروستکردن: بلۆک، چیمەنتۆ، گەچ، دەرگا و پەنجەرە.. لە شار بکڕین. دیسان کەوتینەوە خانو دروست کردن. بناغەکەیمان دانا. خانویەکی دە ژوری بۆ پێشمەرگەکان و، چەند خانویەکی دو ژوری بۆ خۆم و ماڵەکانی تر. لە هەمویان دا تەوالێت، حەمام، چێشتخانەی تایبەتی مان دروست کرد. گەورێکیشمان بۆ ئاژەل و ئێستر دروستکرد و، لە دەوروپشتی خانوەکان چەندین چالمان بۆ خۆپاراستن لە هێرشی ئاسمانی و تۆپباران هەلکەند. وەستا و کرێکاری هەمو خانوەکان پێشمەرگەکان خۆیان بون.

خانوەکان تەواو بون. کاتی خۆی کەلوپەلی بارەگاو ماڵەکەیان لە ناوزەنگەوە گوێزابوەوە هەرزنە و، دوای ئەویش هێنابویانە ئاوەژێ. پێشمەرگە بارەکانیان گومرگ کرد بو، ئەوی بە کەلکیان هات بو برد بویان، تەنیا شتێ نەیان برد بو کتێبەکانم بو، وەکو خۆی مابو. سەرلەنوێ مشوری کەلوپەلی بارەگا و ماڵمان خوارد.

*

بەرو

هەندێ شوێنی بناری ئاسۆس دارستان بو. داری بەرو، قەزوان، گوێز، بەلالوک.. ی لێ بو. پشتی چنارێ لە هەموی چڕتر بو. پاش دانانی بنکەکانی پێشمەرگە، کەوتنە داربڕین: بۆ سوتاندن و بۆ دارەڕای خانو. چەند کەسێکی خەلکی چنارێ هاتن بۆ دەربڕینی بێزارە و نارەزایی. شارەزاکانیان ئەیانوت: لەبەرەوارەکەی پشتی چنارێ دانیشتوانی ناوچەکەی چەند جارێ لە قاتوقڕی و برسێتی و، ئاژەلەکانیانی لە مردن، رزگار کردوە: خەلک بەری داربەرویان خواردوە و، ئاژەلەکەیش گەلاکەی. لە بێزارەی ئەوەدا بون ئەم سامانە بە نرخە لە ناو بچێ.

دارستان بەشێکە لە سامانی نەتەوەیی، لە زۆر جێگا دابەش کراوە و، هەر جوتیارێک «قەدەغە» ی خۆی هەیە، کەسی کە بۆی نیە بیبڕێ، گەلاکەی ئەکەن بە «گەلا» بۆ ئالیکی زستانی بزن و، لق و پۆپەکەی بۆ سوتاندنی خۆیان بە کار ئەهێنن، ئەم جۆرە بڕینە کاری تێ ناکا. بەلام بڕینی بێ پلان و خەلوز کردن، بەشێکی زۆری فەوتاندوە و، ژیاندنەوەی سەر لە نوێ ی کارێکی یەکجار دژوارە.

داری بەرو، چەند جۆرە و، چەند بەری جیاوازی هەیە:

١. بەرو، دانەی بەرو درێژکۆلە و رەنگی قاوەیی تیرە. هەندێکیان گەورەن پێ ی ئەلێن: «وێلو». کلاوێکی پڕاوپڕی سەرەکەی لە سەردایە پێ ی ئەلێن: «جەوت». پێشینان وتویانە: «خوا کلاوی بۆ بەرو کردوە». جەوت بۆ خۆشکردنی کوندە، مەشکە، هیزە.. بە کار ئەهێنری و، بەرویش بە زستان لە ناو ژیلەمۆدا برژاندویانە، یا پێشاندویانە و خواردویانە. لە قاتوقڕی دا هاڕیویانە و بۆ خواردن «خەپلە» یان لێ دروست کردوە. بە زۆری تامەکەی تفت و تالە. بە زەحمەت، بە بێ ئاو، قوت ئەدرێ.

وەکو دەربڕینی بێزاری لە دوبارە بونەوەی خواردنێکی ناخۆش ئەلێن: «بەرو بە کالی، بەرو بە کولاوی، بەرو بە برژاوی..» و، یەکێ کە بە پەلە و بێ پسانەوە قسە بکا

پێ ی ئەڵێن: «ئەڵی ی بەڕوی لە دەم دا تەقیوە!» و، وەکو نیشانەی پەک کەوتن و
نەخۆشیی گران، ئەڵێن: «بەڵە بێ و، بەڕووان نەخوا؟».

٢. مازوو، بەرێکی خڕ و سەختە. لە پایزدا ئەیچنن و لە بازاڕدا بە کێشانە ئەیفرۆشن. بۆ دەباغی پێستە بە کار ئەهێنرێ. پێشینان وتویانە: «بە زۆر بێمەی بۆ مازووچنین بە دارەکەی دا ناڕوانی».

کاروانچی و ئەوانەی زۆر بە ڕێگادا ئەڕۆن، کە پێیان «تلۆق» ئەکات و، پێستی نێوان پەنجەکانیان ئەسووتێتەوە، مازوو ئەهاڕن و لە گەڵ خەنە دا ئەیگرنەوە، لە پێیانی ئەدەن، پێستی پێیان «پنگر» ئەکاتەوە.

٣. گزگڵ.

٤. سیچکە، لە هەندێ ناوچە پێ ی ئەڵێن: «گڵۆان»، بەرێکی تری بەڕووە خڕە لە شێوەی هەڵوژە ڕەشەدا. توێکڵەکەی ڕەق و قاوەیی تێرە، ناوەکەی جۆرێ لە ئاردی زەردی تێ دایە. نرخێکی بازرگانی ئەوتۆی نیە. پێشینان وتویانە: «بە مازووان تێ شکاوە، ئەیەوێ بە سیچکان هەڵیسێتەوە».

هەندێ ساڵ گەزۆ لە سەر گەڵای داربەڕوو ئەباری، گەڵاکەی کز ئەکەنەوە و ئەیکوتن لە بازاڕدا بە کێشانە ئەیفرۆشن، پاش کوڵاندنی «شۆرکە» و «گەزۆ» ی لێ دەر ئەهێنرێ. لێکۆڵینەوەی زانستی دەری خستووە گەزۆ ناباری، بەڵکو جانەوەرێکی پچووکە بە چاو نابینرێ لە سەر گەڵای داری بەڕوو زیاد ئەکا و، لە ئەنجامی هەندێ «تفاعل» ی کیمیایی دا دروست ئەبێ.

داری بەڕوو سەخت و قورسە، بە کەڵکی دارەڕای خانوو نایەت چونکە ئەوەندە قورسە دیوار بەرگەی ناگرێ، بە زۆری بۆ سووتاندن بە کاری ئەهێنن، بەڵام لە ئەورووپا دیکۆری قەشەنگی لێ دروست ئەکەن، نەخشی جوان لە قەدی دارەکەدایە.

*

## مەڵبەندی یەک لە ناو شەڕی عیراق - ئێران دا

هێزەکانی ئێران تا ئەهات لە کوردستانی عیراق نزیک ئەبوونەوە. زەمانەی شەڕ گەیشت بوە ناوچە سنوورییەکانی حاجی ئۆمەران، قەڵادزێ، پێنجوێن. عیراق و ئێران، هیچ لایەکیان دەستیان لە ئێمە نەئەپاراست. هەندێ جار «رصد» ەکانی ئێران کە بە چاوساغی پێشمەرگەکانی پارتی و حسک ئەهاتنە پێشەوە، شوێنەکانی ئێمەیان بۆ ئەکردن بە نیشانە.

شەڕی حاجی ئۆمەران کاری لە مەڵبەندی سێ و، شەڕی قەڵادزە کاری لە بارەگاکانی سەرکردایەتی کرد بوو. ناوچەی ناوزەنگ - شینێ مان چۆل کرد بوو، ناوچەی باوزێ بەشیان پێ چۆل کرد بووین. داوودەزگای ڕاگەیاندن و ڕادیۆ گواستبوویانەوە دۆڵی جافەتی.

شەڕ بە گەرمی کەوتە ناوچەی پێنجوێن. مەڵبەندی یەک کوت بوە مەترسییەوە. هەموو ڕۆژێ بۆردومان ئەکرا. ئەوسا بەکری حاجی سەفەر، لە جێگەی مەلا بەختیار، کرا بوو بە لێپرسراوی مەڵبەندی یەک. ئێمە ئاگاداری بەکری حاجی سەفەرمان کرد، فەرمان بە هێزەکانی یەکێتی بدا پەلاماری جەیشی عیراق نەدەن، بۆ ئەوەی بتوانی هێرشەکانی ئێران ڕابگرێ، چونکە هاتنی ئێران بۆ ناوچەکە ئەبوو بە هۆی چۆلکردنی ناوچەکە و وێرانبوونی و، لە ئەنجامی ئەوەیش دا ئەبوو بارەگاکانی مەڵبەندی یەک و تیپەکانی شارباژێڕ چۆل بکەن.

ماهیر عەبدولڕەشید تکریتی قائیدی فەیلەقی یەک بوو. ماهیر بەعسییەکی

ڕەگەزپەرست بو، لە بەیانەکانی دا جنێوی بە «فورسی مەجوس» و «نەوەکانی دارا و ڕوستەم» ئەدا! هەندێ، پێشمەرگە و، هەندێ لە دانیشتوانی ناوچەکە، گوێیان نە دابوە فەرمانی مەلبەند، بۆ ڤرەخۆری چەک و تەقەمەنی بە دزی مەلبەندەوە، هەندێ بۆسەیان بۆ هێزەکانی جەیش نابوەوە ئازاریان دا بون. ئەویش چەند بەیانێکی پڕ هەڕەشە و جنێوی بە سەر ئاسمانی شارباژێردا بە فڕۆکە بڵاو کردەوە. جگە لەمەیش «تعمیم» یکی بە بروسکە بە سەر کەرتەکانی فەیلەقەکەی دا بڵاو کردبوەوە لە یەکێکیان دا نوسی بوی: «تقرر اباحة عرض و مال المخربين وذويهم».

مەلبەندی یەک توشی گیروگرفتێکی گەورە بوبو. ناوچەکەیان بەردەوام لە ژێر تۆپباران و بۆردومانی هێزەکانی عێراق دا بو. ناچار بون بیر لە گواستنەوە بکەن. لەو کاتەدا بەهادین لەو ناوە بو، کە ئەم پەشێوانە ئەبینی، لە سەر ئاوازی یەکێ لە سرودەکان ئەم بالۆرەیەی ڕێک خست بو:

ئەی هاورێیان! من ڕەنجدەرم

من .....م
قوری دنیا بە سەر سەرم
جاش و عەسکەر هاتنە سەرم
مەلبەندی یەک بۆ کوێ بەرم؟

*

## شەڕ لە ٣ مەیدان دا

ئێمە لە ٣ لاوە لە شەڕەوە گلا بوین: شەڕ لە گەڵ عێراق، شەڕ لە گەڵ ئێران، شەڕ لە گەڵ جود. زۆر کەس بە شێتیان ئەزانین و، ئامۆژگارییان ئەکردین بۆ ماوەیەکیش بێ، شەڕ لە یەکێ لەم مەیدانانەدا سارد بکەینەوە.

هەوڵەکانی خۆمان لە گەڵ جود بەری نەگرت.

هەمو ئەو وتارانەی لە رادیۆ بە نیازی بانگکردنی لایەنەکانی جود بۆ ئاشتی، بەو پەڕی توندی و، بە جنێوی ناشیرین، لە رادیۆی پارتیەوە وەڵامیان ئەدرایەوە.

هەمو ئەوانەی ئامادەییان پیشان دا بو بۆ ناوبژی لە نێوان یەکێتی و جوددا، ئێمە قبوڵمان کرد بو، لە ناو ئەوانەدا مەلا، ڕیش سپی، سەرۆکی عەشیرەت، ئەدیب، مامۆستای زانستگایان تێ دا بو. نە پارتی و نە حشع گوێیان نەئەدایە قسەی هیچ کامێکیان. پەیوەندی لە گەڵ سەرانی جود بۆ کەسانی کە لە سلێمانی و بەغدا ئەژیان کارێکی دژوار بو، چونکە ئەوان لە ئێران بون و، کەس بە ئاسانی دەستی ئەیان ئەگەیشتێ.

مامجەلال نامەی بۆ کاربەدەستانی سوری و، بۆ خالید بەگداش سکرتێری حیزبی شیوعی سوری و، بۆ نایف حەواتمە سکرتێری جبهەی دیموکراتی فەلەستین نوسی بو، داوای لێ کرد بون لە نێوان یەکێتی و حشع دا ناوبژی بکەن. حشع گوێیان نەدانێ و، ئامادەی ئاشتبونەوە نەبون.

ئومێدێکمان نەمابو بەو نزیکانە لە گەڵ جود ئاشت ببینەوە، بە تایبەتی سەرانی جود لەو کاتەدا زیاتر کەوتبونە ژێر «ئیمتیاز» ی ئێرانیەوە، ئێران خۆی ئامادە نەبو لە گەڵ یەکێتی پێک بێ، لە بەرئەوە ڕێگەیشی بە جود نەئەدا لە گەڵ یەکێتی ئاشت بێتەوە.

ئێمە لە گەڵ دەرەوە پەیوەندیمان زۆر کز بو. زۆرجار بە رادیۆ پەیامی کورتمان بۆ

ئەناردن. لە پەیامەکان دا ناوی نهێنی ئێمە بە کوردی: «ئاسودە» و بە عەرەبی: «صابر» و، هی هەڤالانی دەرەوە کە لە شام وەریان ئەگرت بە کوردی: «ئاوارە» و بە عەرەبی: «صامد» بو. پەیامـەکـەی خۆمـان بە رادیوکـەی یەکیتی دا ئەنارد و، پەیامـەکەی ئەوانمان لە رادیوی «صوت العراق» وەرئەگرت کە بەعسیە عیراقیەکانی سەر بە سوریا سەرپەرشتییان ئەکرد.

پەیامێکمان نارد بۆ هەڤالانی دەرەوە. کورتییەکەی ئەمە بو:

ئێمە لە ٣ لاوە لە شەڕەوە گلاوین. هەولی زورمان داوە لە گەل جود پێک بێین. سەری نەگرتوە. لە گەل سوریا و لیبیا و فەلەستینییەکان هەول بدەن شەڕی ئێمە و جود رابگرن و، ئێران ئێتمان بۆ نەهێنی، ئەگینا ناچارین خۆمان هەول بدەین شەڕ لە گەل عیراق رابگرین.

لەو کاتەدا د. فوئاد مەعصوم، عەبدولرەزاق فەیلی، دارای شێخ نوری، سەرپەست بامەرنی، حسین سنجاری.. لە شام بون.

*

### ئازادکردنی بیتواتە

بیتـواتـە گوندێکە کـەوتوتە بناری چیای مـاکوک و چیای شـیشـار بە سەری دا ئەڕوانی. جێگایەکی خۆش و ئاووهەوای سازگارە. پێ ئەچێ لـە زۆر کۆنەوە ئاوەدان بوبێ، هەندێ شوێنەواری دێرینەی تێ دا دۆزراوەتەوە. خەلکی بیتواتە لە بەخێوکردنی بزنی مەرەز و، دروستکردنی کردا شارەزاییەکی زۆریان هەبو. زۆر مال دەزگای تەونگەری تێ دا بو.

لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول دا عومەر مستەفا بنکەی پێشمەرگەی تێ دا دانا و، بو بە بنکەی هێزی کاوە. پاشان مەلا مـستەفا عەلی شـەعبان بارزانی لێ دانا، کـە یەکێ لە هاوسەفەرەکانی سۆڤیەت و باوەڕپێکراوێکی نزیکی بو. عەلی شەعبان کابرایەکی زۆردار بو. ریزی دانیشتوانی ناوچەکەی نەئەگرت. بێگاری پێ ئەکردن و، خەریکی خۆ دەولەمەن کردن بو. بە زۆر کچی یەکێ لە بنەمالە ناسراوەکانی ناوچەکەی هێنا.

ئەنوەر بەگ، کە لە بنەمـالەی میرانی خۆشناو و، ژنبرای عـەباسی مامەند ئاغا بو. لە پەنجـاکـان دا کـرێکاری دائیـرەی غـابات و، لە سـەرەتای شـۆڕشی ئەیلول دا بەشـداری خۆپیشـاندانی چەکـداری عـشـائیر بو، هاتە ریزی شـۆڕشـەکەوە، لە بیـتـواتە دائەنیـشت، بە بیانوی گێچەلی عـەلی شەعبـانەوە هەلات و، پەنای بۆ حکومـەت برد. هێزێکی جـاشی لە ناوچەکـەدا پێکەوە نا. ئەم هێـزە تا بەیانی ئازاری .٧ مـابوەوە. دوای ئەوە چو بۆ بەغـداد لەوێ دانیشت. بۆ دابینکردنی گوزەرانی خێزانەکەی چاخانەیەکی دانا بو.

کە بەعس کەوتەوە جاش گرتن. ئەنوەر بەگ سەرلەنوێ چەکێ بۆ حکومەت هەلگرت دژی شۆڕشەکە. دوای ئاشبەتال گەڕایەوە بیتواتە و، بو بو بە دەسەلاتدارترین کەسی ناوچەی خۆشناوەتی. لە دوای دەس پێکردنەوەی خەباتی چەکـدار ئەنوەر بەگ سـالی ١٩٧٧ دەسـان مـەفرەزەیەکی جاشی دروست کردەوە. لە لەشکرکێشـیەکانی حکومـەت دا بەشداری ئەکرد و، هەندێ جار هێزەکەی ئەنارده راوی پێشـمەرگە. ئەگەر جاران بەهانەی ئەوە بو لە دژی بارزانی بوە بە جاش ئەمجارەیان هیچ بیانویەکی لەو بابەتەی نەبو، چونکە ئەم پێشـمەرگانە بارزانی نەبون، بەلکو پێشمەرگەی یەکیتیی نیشتمانی و، هەندێکیشیان خۆشناو بون. ئەنوەر بەگ بە هۆی ئەم دەسـەلاتەوە ترس و لەرزێکی زۆری خست بوە ناو دلی دانیشتوانی ناوچەکەوە،

هەرکەس گوێڕایەڵی نەکردایە و، دڵسۆزیی نەنواندایە، ئازاری ئەدا.

مینێک لە ژێر ئۆتۆمۆبێلێک دا تەقییەوە. یەکێ لە کوڕەکانی ئەنوەر بەگ لە ناو ئۆتۆمۆبێلەکەدا کوژرا. لە سەر ئەمە ناردی کوێخا ڕەسوڵی بیتواتە بگرن. کوێخا ڕەسوڵ لە ڕانیە دانیشتبو، هاووڵاتییەکی ئاسایی بو، تەنیا تاوانی ئەوەبو باوکی ڕەشۆ بو کە پێشمەرگەی یەکێتی بو. کوێخا ڕەسوڵ بە مەی زانی لە دەستیان هەڵات و پەنای بۆ بارەگای حیزبی بەعس برد لە ڕانیە. ئەنوەر بەگ ناردیە ناو بارەگای بەعس کوێخا ڕەسوڵیان دەرهێنا. بارەگای بەعس کوێخا ڕەسوڵیان نەپاراست. هەر لەوێ دا کوشتیان و، لاشەکەیان بە دوای ئۆتۆمۆبێلێک دا تا بیتواتە ڕاکێشا و، لەوێ بە بەر چاوی خەڵکەوە لاشەکەی سوتاند. ئەم تاوانە بێ سزا تێ پەڕی.

ئەو کاتەی هێزەکانی ئێمە هاتنە خوارێ بۆ دۆڵی باڵیسان، سنوری دەسەڵاتی ئەنوەر بەگ لە بیتواتە و ڕۆژهەڵاتی دا بو. بەڵام کە بارەگای مامجەلال گوێزرایەوە بۆ دۆڵی باڵیسان و دواتر بۆ بۆتێ لە دولە ڕەقە. ئەنوەر بەگ ویستی دەس بە سەر ناوچەکەدا بگرێ، ڕێگای ڕانیە بۆ خەلیفان بۆ هێزەکانی حکومەت بکاتەوە و، بارەگا و هێزەکانی مەڵبەندی چواری یەکێتی لە دۆڵی باڵیسان دەربکا. کردیە سەر هەمو گوندەکانی ناوچەکە کە ئەبێ چەکی جاشایەتی بۆ حکومەت هەڵبگرن. دانیشتوانی ناوچەکە کوردپەروەر بون ئەیان ئەویست ببن بە جاش کەوتە گەف و هەڕەشە لێیان.

ئەنوەر بەگ بە تیرێک دو نیشانی ئەشکاند. سەرکەوتنێکی جەنگیی بە سەر یەکێتی دا بۆ حکومەت بە دەس ئەهێنا و، جادەیەکی ستراتیجی بۆ هاتوچۆی هێزە چەکدارەکانی عێراق ئەکردەوە. لە هەمان کات دا ئەیکرد بە منەتێکی گەورە بە سەر جودا، یەکێتی جودی لە خۆشناوەتی دەرکرد بو، ئەویش یەکێتی دەر ئەکا. بەشێ لە چەکدارەکانی جود کە تەسلیم بوبونەوە لای ئەنوەر بەگ ببون بە جاش و، چەندین جاش - پێشمەرگەی پارتی لای ئەنوەر بەگ ئامێر مەفرەزە بون.

د. کەمال خۆشناو، لێپرسراوی مەڵبەندی چوار، ئەویش بەگزادەی خۆشناوە. بە زمانی شیرین هەواڵی بو نارد کە زۆر لە دانیشتوانی ناوچەکە نەکا و، واز لەو پلانە بهێنێ. ئەنوەر بەگ وەڵامی دابوەوە کە ئەو گەورەی ناوچەکەیە و، ناوچەکە هی خۆیەتی، ئەبێ مامجەلال و مەڵبەند ناوچەکە بە جێ بهێلن. لە هەمان کات دا کردیە سەر سەرگەورە و ڕیش سپییەکانی ناوچەکە، هەمویانی گل دابوە و، بە زۆر گوندەکانی زێوە، هەرتەل، وەری، نێوە، سەردۆل، مێرگەسەر، چیوە... ی چەکدار کرد و، بە شۆفل و بلدۆزەر سەنگەر و ڕەبیەی پێ دروست کردن. کار وا بڕویشتایە هەمو ناوچەکەی ئەگرت.

لە ناو بیتواتەدا کۆمەڵە ڕێکخستنی باش و بەهێزی هەبو. ئاگاداریی وردیان لە سەر هێز و شوێنەکانی چەکدارەکانی ئەنوەر بەگ و حکومەت هەبو. مامجەلال خۆی لە بۆتێ بو، کە نزیک بو لە ناوچەکەوە. لە سەر بنچینەی ئاگاداریەکانی شانەکانی کۆمەڵە و، بە پرس و ڕاوێژی ئەوان، نەخشەیەکی دانا بۆ گرتنەوەی ئەو گوندانەی گیرا بون و، بۆ دەرکردنی ئەنوەر بەگ لە بیتواتە. مامجەلال هێزەکانی مەڵبەندی ٣ و چواری ساز دا و، لە مەڵبەندەکانی ١ و ٢ هەندێ هێزی تری داوا کرد.

*

### نەخشەی سەرکەوت

مامجەلال نەخشەکەی بە ناوی حیزبیی مامۆستا جەمال تاهیر «سەرکەوت»ەوە ناو نا بو، کە تازە بە هۆی وەرگەرانی ئۆتۆمۆبیلەوە لە دۆلی بالیسان کۆچی دوایی کرد بو.

هێزەکانی کرد بو بە ۳ بەش بۆ ئەوەی لە ۳ قۆڵەوە پەلامار بدەن:

قۆڵی یەکەم، هێزەکانی مەلبەندی چوار بە سەرپەرشتی شەوکەتی حاجی موشیر بۆ شاخی هەوری و گرتنەوەی چیوە و سەردۆڵ و میرگە سەر.

قۆڵی دوەم، هێزەکانی مەلبەندی سێ بە سەرپەرشتی حەسەن کوێستانی بۆ شاخی شیرە و گرتنەوەی دەرە زیوە.

قۆڵی سێیەم، هێزەکانی مەلبەندی یەک و دو بە سەرپەرشتی مامجەلال خۆی، لە دۆڵی شاورەوە بو سەر شاخی ماکۆک و ئینجا دابەزین بۆ ناو بیتواتە.

رۆژی ۲۰ ی تشرینی یەکەم قۆڵەکەی مەلبەندی چوار هێرشەکەی دەس پێ کرد. گوندی نێوەیان گرت و شکانی جاشەکان دەستی پێ کرد و، لە هەمو قۆڵەکانەوە پەلامار دران. بو رۆژی دوایی هەمو دۆڵی بالیسان و بیتواتیش کەوتە دەس پێشمەرگەی یەکێتی و، هەمو هێزەکان لە بیتواتە یەکیان گرتەوە.

ئەمە شەڕێکی گەورە بو، هێزێکی گەورە بەشداری تێ دا کرد و، لە ناوچەیەکی شاخاوی فراوان دا بو. توانای یەکێتی بۆ شەڕی گەورە دەرخست. سەرکەوتنێکی گەورە بو بۆ پێشمەرگە و بۆ دانیشتوانی ناوچەکە، ورەی خەلکی زۆر بەرز کردەوە. بەلام تالان و راووت، بە تایبەتی لە بیتواتە، رەونەقی ئەم سەرکەوتنەی کەم کردەوە. مالی هاورێکانی کۆمەلەیش لە بیتواتە کە دەورێکی کاریگەریان هەبو لەو سەرکەوتنەدا بەر تالان و سوتان کەوت. مامجەلال لەم تالانە زۆر نارەحەت بو. فەرماندەکانی کۆ کردەو و سەرزەنشتی کردن و، لیژنەیەکی لێکۆلینەوەی دانا بۆ وەرگرتنەوەی کەلوپەلی تالانی. راستییەکەی ئۆبالی ئەم کارە لە پلەی یەکەم دا ئەکەوتە سەر دەزگای راگەیاندن، بە تایبەتی رادیو، نەک پێشمەرگەکان. چونکە دەزگای رادیو، وەکو بەشی لە راگەیاندنی شەڕ بۆ بەرزکردنەوەی ورە و، تاودانی هەلمەتی شۆرشگێرانەی پێشمەرگەکان، هانی دابون: دەستیان لێ نەپارێزن و، مالیان تالان بکەن و، خانوبەرەیان ئاگر تێ بەر بدەن.

*

### مفاوەضە لە گەل بەعس

لەو چەند مانگەدا کۆنفرەنسی ناوچەیی کەرتەکانی رێکخستنی کۆمەلە تەواو بو. ئازاد هەورامی، رێکەوتی عوسمان بەگ، قادری حاجی عەلی بەگ، کە سەرپەرشتی کۆنفرەنسەکانیان کرد بو، هاتنە ئاوەژێ بۆ ئەوەی ئەنجامی کارەکەیان بۆ من باس بکەن.

ئەرکەکانی کۆنفرەنس چەند شتێ بو:

۱. هەلسەنگاندنی هەلومەرجی رێکخراوەیی، پێشمەرگەیی، دارایی.. کەرتەکە و، هەلومەرجی سیاسی کوردستان و عیراق.

۲. هەلبژاردنەوەی ئەندامانی کەرت.

۳. هەلبژاردنی نوێنەرانی کەرت بۆ کۆنفرەنسی سێیەم.

٤. وەرگرتنی بیروڕای ئەندامان لە سەر گفتوگۆ لە گەل بەعس، ئاخۆ زۆرایەتی لە

جگە لە مان، د. سەید عەزیزی شەمزینی و صەلاحەدینی موهتەدی و چەند کەسێکی تر بەردەوام نامەیان لە گەڵ مامجەلال ئاڵوگۆڕ ئەکرد.

*

کۆمەڵە لە ئێران لە ناو خۆیان دا بڕیاریان دابو خانەی موعینی کە یەکێ لە کادرەکانی سەرکردایەتیان بو، تازە لە زیندان بە سەربەرزی دەرچو بو، بنێرن بو کوردستانی عیراق بو لای ئێمە. محەممەدی مەلا عەلی هێنا بوی بو ناوچەی ئالان بەرەو روی ئەحمەد فەتحوللا، جێگری فەرماندەی هەرێمی ٣ ی، کرد بوەوە بیگەیەنێتە لای ئێمە. لەو کاتەدا شوێنی ئێمە ناديار بو.

چەند روژێ خانە لە گەڵ ئەحمەد بو، جەیش لە ٢١ ی حوزەیرانی ٧٨ دا هێرشی بو کردن بو سەر «کانی بیشو» لە نزیک گوندی «دری» لە ناوچەی ماوەت. لەم هێرشەدا ٦ کەس کوژران، یەکێکیان ئەحمەد و ئەوی تریان خانە بو.

خانە، وەکو هاوڕێکانی ئەیانوت گەنجێکی روشنبیر و تێگەیشتو و ئازا بو. برای شەهیدان: سولەیمان و عەبدوللا و، کوری محەممەد ئەمینی موعینی بو.

دوای کوژرانی خانە دو کەسی تر لە هاوڕێکانی بڕیار ئەدەن بێن بو کوردستانی عیراق، ئەودەم ئێمە لە دەراوی گورگان بوین لە قەندیل، هەردوکیان گەیشتن: د. جەعفەری شەفیعی خەڵکی بوکان و، ساعیدی وەطەندوست (کاک براییم) خەڵکی سنە بون. ساعید لە گەڵ خوی چەردەیەک پارەی بو هێنا بوین پاشەکەوتی کرد بو. د. جەعفەریش لەو کاتەدا بو ئێمە زور بە سود بو چونکە پزیشکمان نەبو. تەنیا یەک برینپێچمان هەبو، ئەویش هەر ئێرانی بو، ئەندامی «سازمانی ئینقیلابی» بو.

دو پیاوی روشنبیر و تێگەیشتو و بە زات و ورە بەرز بون. حەزیان نەئەکرد کەس بزانی کە ئێرانین و ناویان چیە

*

روژێکیان لە بەردەمی چادرەکەی خومان دا دانیشت بوین، حەمە سەعید لە دوورەوە دو کەسی بە دی کرد، یەکێکیان جلی کوردی و، ئەوی تریان پانتولێکی جینز و کراسێکی زەردی لە بەر دا بو، پرچی بەر دا بوەوە. وتی: «وابزانم روژنامەنوسە».

کە نزیک کەوتنەوە پانتول لە پێکە عومەری حاجی عەبدوللا بو. زورم پێ خوش بو ئەویش بە سەلامەتی گەیشتەوە لامان. کاک عومەر لە گەڵ کاروانەکەدا رویشت بو بچی بو سوریا و، لەوێوە بە یەکجاری بروا بو ئەوروپا. قەم نامەیەکیان پێ دا نارد بو بو سەرکردایەتی کومەڵە. بە ناو ئێران دا لە مەهابادەوە بە نهێنی لە گەڵ یەکێکی شارەزادا

گەرا بوەوە. کردم بە گاڵتە لە گەڵی، وتم: «سەفەری دەرەوت کرد. دو وڵاتی بیگانەت بە بێ پاسپورت و ڤیزا بینی - مەبەستم تورکیا و ئێران بو - ئیتر هەقی گلەییت نەماوە!»

کاک عومەر لای ئێمە گیر نەبو ئیزنی خواست بو سەردانی کەسوکاری بگەرێتەوە نزیک سلێمانی.

سەرانی قم، سامی سنجاری و هاورێکانی، چەند جارێ لە گەڵ ئازاد هەورامی و عومەر دانیشت بون. بەو ئیعتیبارەی هەردو ڕێکخراو: «قم» و «کومەڵە» مارکسین، باسی ڕێککەوتنی دوقولی و هاوکارییان لە گەڵ کرد بون. بو دەربڕینی نیازی باشی خویان ئەم نامەیەیان نوسی بو و، داویان بە عومەر بیهێنێ و، دریژەی قسەکانیشمان بو بگێڕێتەوە.

قم تاکتیکێکی زیرەکانەی هەڵبژارد بو: ئەیویست یەکێتی لە ناوەوە هەڵ بوەشێنێ. پەیوەندی لە گەڵ کومەڵە و بزوتنەوە، بە جیا لە یەکێتی یان وردتر بە جیا لە مامجەلال، دروست بکا. لەوێ، لە گەڵ ئازاد و عومەر لە سەرکردایەتی کومەڵە دانیشت بون و، ئەم نامەیەیان بو کومەڵە نوسی بو، هەر بەو جورە لە گەڵ کاک تاهیر و سەید کاکەش لە سەرکردایەتی بزوتنەوە دانیشت بون و، پەیوەندییان لە گەڵ ڕەسول مامەند کرد بو.

تاکتیکەکەی سامی بە سەر ئێمەدا لە کومەڵە تێ نەپەڕی، ئێمە سور بوین لە سەر ئەوەی کە ئەگەر بیانەوێ ڕێک بکەون ئەبێ لە گەڵ یەکێتیی نیشتمانی ڕێک بکەون، نەک لە گەڵ باڵەکانی و، داوامان لێ کردن چارەنوسی هەڤاڵە بزرەکانمان ئاشکرا بکەن و، لە گەڵ ئەوان گفتوگوی ڕێککەوتن دابمەزرێنن.

بە ڕاوێژ لە گەڵ مامجەلال و د. مەحمود وەڵامی نامەکەمان بو نوسینەوە. هەر ئەو کاتە ئەسلی نامەکەی قم و وێنەی وەڵامەکەی خومانم بو ئاگاداری و هەڵگرتن نارد بو هەڤالانی دەرەوە. ئەبێ لە لایان مابێ.

بەڵام تاکتیکەکەی سامی کاری لە بزوتنەوە کرد و، پشێوییەکی زوری خستە ڕیزەکانیانەوە. ڕەسول و هەندێ لە هاورێکانی شارێ کە ماوەیەک بو نارازی بون لە یەکێتی، ئەو کارەساتەی بە سەر یەکێتی هات بو داێنا بە بەڵگەی ڕاستیی بوچونەکانی خویان. بە تەنیا کەوتنە پەیوەندی و گورینەوەی نامە. ئەمەش پێچەوانەی ئەو ڕێککەوتنانە بو کە لە ناو خومان دا لە سەری پێک هات بوین. پەیوەندی لە نێوان هەر ٣ باڵەکە دا: کومەڵە، بزوتنەوە، خەتی گشتی، لە سەر بنچینەی جورێ لە فیدرالیزم ڕێک خرا بو. لە ناو یەکێتی دا هەر باڵە سەرکردایەتی تایبەتی و، سەربەخویی ئایدیولوجی و، ڕێکخراوەیی خوی هەبو، بەڵام لە کاروباری پێشمەرگەیی و، دارایی و، پەیوەندی سیاسی

# بەڵگە

١. وتارێکی گۆڤاری «ڕوناهی»، شام، ژمارە ١٧، ساڵی ٢، ١ ی ئابی ١٩٤٣
٢. شەجەرەی بنەماڵەی بارزانی. دوای ئاشبەتاڵ دائیرەی «ئەمن» ئامادەی کردوە.
٣. لیدوانی «پراڤدا» لە سەر شەڕی کوردستان. ڕۆژنامەی «الاخبار» بیروتیەوە، ڕۆژی ٦٣/٧/١٤
٤. لیدوانی ڕۆژنامەی «الجمهوریە» ی بەغدادی، ڕۆژی ٦٥/٣/١٤
٥. گفتوگۆیەکی ڕۆژنامەوانی شیخ ئەحمەد. ڕۆژنامەی «البلد»، ڕۆژی ١٩٦٥/٢/٢٤
٦. نامەی حەبیب محەمەد کەریم بۆ ئەمیر.
٧. نمونەی موهاتەراتی ساڵی ٦٦ لە «خەبات» ی مەلایی و جەلالی دا.
٨. سەرژمیری چوار ساڵی شەڕی یەکیتی - بەعس. «الشرارە» ی مایسی ١٩٨٠.
٩. تەقریری «ئەمنی عام» بۆ صەددام حسین لە سەر خۆپیشاندانی شارەکان.
١٠. بەرنامەی کۆمەڵە بۆ: پیشکەوتنی کۆمەڵایەتی و، چارەسەرکردنی کیشەی نەتەوایەتی.
١١. نمونەیەک لە بڵاوکراوە ناوخۆییەکانی کۆمەڵە: «ژیانی ڕیکخراوەیی».
١٢. بەیانی یەکیتی و بەڵگە دەربارەی شەڕی یەکەمی جود.
١٣. بەیانی یەکیتی و بەڵگە دەربارەی شەڕی دوەمی جود.
١٤. ڕاپۆرتیکی ئیستیخباراتی عەسکەری باسی دەوری خۆیان ئەکا لە خۆشکردنی ئاگری شەڕی ناوخۆی کوردا.

## هەوڵدانێکی تری ی ن ک :
## بۆ ئاگربڕی شەڕی ناوخۆ
## هەوڵێکی تری خائینانەی سەرکردایەتی بەرزانی بۆ هەڵگیرساندنەوەی شەڕ

سەرەڕای ئەو هەموو تاوانەی ق م هەر لە ١٩٧٥ ەوە تا ١٩٨١ بەرانبەر بە ی ن ک کرد بوی لەگەڵ ئەوەشدا
لە کاتێکدا کە لە پایزی ١٩٨١ دا گفتوگۆ و کۆمەکی سیاسی ـ چەکداری چوارقۆلی جاشەکانی جود ی تیا تێشکاندە،
شەڕی لەگەڵ وەستاندن و ئامادەیی خۆی نیشان دا بۆ پێکەوەژیانی هێمنانە لەگەڵ ق م لە کوردستانی عێراقدا
بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە کوردستانی عێراق و دەس لە شەڕی شۆڕشی کوردستان هەڵبگری. ئەوەبوو دوجار
نوێنەری خۆی نارد، بۆ ڕازان ( بارەگای سەرکردایەتی بارزانی ) بۆ ئەوەی کات وشوێنی چاوپێکەوتنی نوێنەرانی
هەردولا لەسەر هەر ئاستێکی ئەوان ئەیانەوێ ولەهەر شوێنێکی ئەوان ئەیانەوێ، دیاری بکەن. کەچی هەردو
جارەکە نوێنەرەکمان بەدەستی بەتاڵ گەڕابەوە. تا لە بری وەستانیان بە کەلکی لە شارەزوور و شارباژێڕەوە خۆیان
بکەنەوە بە کوردستانی عێراق دا. لەگەڵ ئەوەشدا هەم لەسنووری سلێمانی دا وهەم لەسنووری هەولێردا دو
ڕێکەوتنی مەیدانییان لەگەڵ ئێمەدا کرابوو ئەوەی بێ شەڕ وبێ تەگەرە هێزەکانی خۆیان لەیێ بوی ئێرانەوە
بپەڕنەوە بۆناو کوردستانی عێراق. بەڵام ئەوان نەک هەر هێزی ڕاستەقینەی خۆیان و سەرکردە و بەرپرسراوەکانی
خۆیان نەهێنایەوە کوردستانی عێراق وە نەک هەم قورسایی پێکی عەسکەرییان لەسەر عێراق دروست نەکرد و
شەڕیان نەکرد. ومنەک هەر دەستیان لە هێرش بردنە سەر شۆڕشی کوردستانی ئێران هەڵ نەگرت، بەڵکو
وەستیان لە ڕێگەی ئەو گەنجەر وگوجەرانەوە کە ناردبوانەوە بۆ شارباژێڕ وخۆشناوەتی هەم سەرچاوەی زیادکردنی
بەشەڕی پەیدا بکەن بۆ ناردنیان بۆ جاشێتی بۆ بوی ئێران. وە هەم بە شێوەیەکی زۆر نامەردانە کەوتنە شەر
فرۆشتن بە هێزەکانی یەکیتی وخەریکە کرد نیان بە دروستکردنی ڕوداوی لا بەلا وە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی بە
جۆرێکی بەربلاو کەوتنە دەس تێکەڵاوکردن لەگەڵ ئەرتەش وپاسدار و بەسیجی ئێرانی دا بۆداگیرکردنەوەی
مەهوەری خانە ـ سەردەشت وپەلاماردانی بنکەکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەی شۆڕش
گێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران. تا کار گەیشتە ئەوەی هێزەکانی خۆیان لە ئاڵوەتان و دوایی تر لە
کونەمشک لە نزیک بارەگاکانی سەرکردایەتی ی ن ک هۆڵ دا بە نیازی پەلاماردانی ناوچەکانی ناوزەنگ، زەڵێ،
شێنێ کە ماوەی ٥ ساڵ بو بارەگا گرنگەکانی سەرکردایەتی ی ن ک ی لێ جێگیر بوبو وە بوبوە بنکەی حەوانەوەی
چەند بن تاقمی ئازادیخوازی عێراقی وکوردستانی.

ق م ماوەی چەند مانگ بەشێکی گرنگی هێزەکانی ی ن ک یان بەخۆیانەوە خەریک کرد ـ هەروەها بە
گرتنی خەڵک لەبەردەمی مەزودا. سەبارەت بە نیازی شەر فرۆشانەی ق م. کومیتەی سەرکردە... یەکیتیی
نیشتمانیی کوردستان ڕونکردنەوەیەکی لەسەرهاتنی هێزی ق م بەسەرکردایەتی سو
میرخان بوسەرگردی بێران لە بناری جبای جاسوسان بەرانبەر بارەگاکانی سەرکردایەتیبود سەیکردنی تەقە
دەرکرد.

سەرەڕای ئەمانە هەموی ی ن ک هەوڵی دا لەگەڵ ق م کە ئاگربڕی شەڕی ناوخۆ بکات. لەڕێگەی دوستانی
سوری و لیبی و چەند حزب و ڕێکخراوی بیگانەوە. وە لەڕێگەی حشع و چەند بن کەس ولا یەنی ترەوە، هەوڵیدا
کە شەر لەخۆی دوور بخاتەوە. تا ڕادەی ئەوەی کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ حەسو میرخان ئاشکرا کرا بو
ئەوەی بزانن نیاز لە هاتنەکەی چیە؟ ئەگەر گەڕەکیەتی بێتەوە کوردستانی عێراق ئەوە کەس ڕێگەی لێ ناگری، خو
ئەگەر گەڕەکیەتی هێزەچەکدارەکانی حکومەتی ئێران بەناوچە ئازادەکانی کوردستانی عێراقدا وەربکات ئەوە ڕێگەی پێ
نادرێ، سەرکردایەتی ی ن ک هەڤاڵ محمدی ڕەحمان فەرماندەی تیپی ٦١ ی کورەش کە لێپرسراوی ناوچەکە
بو لەگەڵ هەڤاڵ علی وەیس کە ڕابەری سیاسی تیپەکەی ئاسوس بو ڕاسپارد ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ حەسو
بکەن وئەگەر ڕازی بو بیبینن و گفت وگۆی لەگەڵ بکەن وهەوڵ بدەن لەگەڵی بگەنە ئەنجامێکی هێمنانە.

هەڤاڵ محمد نامەیەکی بو حەسو نوسی

کوردستان یان نەمان

بو/ برای بەڕێز کاک حەسو میرخان

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم

هیوادارم سەرکەوتوبن بوخزمەتی ڕەوای گەلە زۆر دەستکەمان کە ساڵەهای ساڵە گەلی کورد مان چاوەڕوانیەتی

سلاوم هەمە بۆگشت ئەوبرادەرانەی کەلاتان مەوجودن

برای بەڕێز وەکو زانیومانە ئێوە نیازی گەڕانەوەتان هەیە بۆ کوردستانی داگیرکراومان بەلام دەبینی هەندێك تەقەی دەرەو دەوروروی داوە لە تیوان هێزەکانمان ،بنا براکیان ئەگەر ئێوە نیازی گەڕانەوەتان هەیە بەتەواوی و تەتانەوی بێنەوە بەهەمدوك لامان بەرووی دوژمنی داگیرکەرا بوەستین وەخوشتت ئەزانی ماوەی چەند سالە ئێمە دژی شەڕی کورد بەکورد بەکوشتندا ئەبین .وە ئێستاش هەمیشە ئامادەین بۆ هاوکاری وبرایەتی لەریگای کوردایەتی دا .جا زۆرمان پێ خۆشە ئەگەر مەجال هەبایە نوێنەرێکی ئێمە ونوێنەرێکی ئێوە ،چاومان بەیەك بکەوی وگفتوگوڵە کەڵ یەکتری بکەین وە روون کردنەوەی زیاتری وەزعی هەردوو لامان .خوشتان ئەزانن کە ئێستا هێزەکانی ئێمە و ئێوە لە هەموو شوێنەکانی کوردستان بەیەکەوە هاوکاری یەکتر ئەکەن لەیەك سەنگەردا ئەجەنگن دژی دوژمنی داگیرکەر هیوادارین لەپرەش هەر بەم شیوەیە بێت و چونکە جەماوەر چاوەڕوانی برایەتی دەکات ئەوەك شەڕی کورد بەکورد بەکوشتن دان وە بە نوسراو هەر ئەوەندە ئەکری بەلام ئەگەر بێت و هەردو لامان یەکتر ببینن بەلکو ئەنجامی زیاتر روون ببێتەوە وباشتر بێت .

شەڕی ناوخومان لەبەرژەوەندی داگیرکەرانی کوردستانە نەوەك لەبەرژەوەندی گەلەکەمانە .

هەر سەرکەوتوبین

دلسوزتان محمد رەحمان
١٩٨٣/٢/١٠

تی بی نی
١) ئێمە زۆرمان پێ خۆشە لەم رۆژانەدا کە بەهار کاری لەسەنگەرەکانی کوردستان دا بین و دژی دوژمن بجەنگن .
٢) تکایە جوابمان بۆ رەوانە بکەنەوە بە زوترین کات .

حەسوش وەڵامی نامەکەی بە هەڵگری نامەدا داپەوە و موافەقەتی کرد بۆ لەسەر دیتنی نوێنەرەکەی یەکێتی ، سەرکردایەتی یەکێتی بوشایەتی وای بەچاك زانی نوێنەری حشع یشیان لەگەل بێ ، بۆیە هەڤاڵ محمد لە نامەی دووەمدا بۆ حەسوی نوسیوە کە ئەمە دەقەکەیەتی :

کوردستان یا نەمان

برای بەڕێز کاك حەسو میرخان
سلاوێکی شۆرشگێرانە ... هیوادارین سەرکەوتو بن
برای بەڕێز نوسراوت گەیشت دەربارەی چاوپێکەوتنەکە ئاگاداری سەرکردایەتیم کرد ئەوانیش زوریان پێ کارێکی باش وبرایانەیە بەلام ئەگەر پێتان باش بێ ئەوا برادەرێکی حزبی شیوعی لەگەل خومان ئەهێنین بوئەوەی هەر ٣ لامان پێکەوە دانیشین و قسە بکەین جا ئەگەر پێتان باش نیە ئەوانیش لەگەل بن ئاگادارمان بکەنەوە هەر خومان لەگەل ئێوەدا کۆ ئەبینەوە .

وە شوێنێك دیاری ئەکەین بۆ دانیشتنەکە کە بۆ هەردولامان نزیك بێت . هیوادارم توش رەئیت هەروابێت . هاوکاری وبرایەتی نزیك بکەینەوە .خومان دوربخەینەوە لەشەڕی لا بەلا لەبەرئەوەی جەماوەر دژی شەڕی ناوخویە و پێی خوشە ئێمە هەموومان بەیەکەوە دژی دوژمنی داگیرکەر لەیەك سەنگەردا بین

تکایە بەپەلە ئاگادارمان بکەنەوە بەلکو بەیانی چاومان بەیەك بکەوی ئەگەر هات و یەك دوو نەفەر بەرەو ئێوە هاتن تکایە رێگایان پێ بدەن

هەر سەرکەوتوبین .

دلسوزتان محمد رەحمان
١٩٨٣/٢/١٢

حەسو موافەقەتی لەسەر دیتنی نوێنەرانی یەکێتی و حشع کرد .هەڤالان محمد رەحمان وعلی وەیس بە نوێنەرایەتی یەکێتی و ابوشوان (قادر رشید ناسك) و محمودی حاجی خدر بە نوێنەرایەتی حشع چونە دەمەتەقێ وەزنی و حەسو میرخان وازۆکە . وحەمید رێکانیشیان ئەبێت .

نوێنەرانی یەکێتی لەو کۆبوونەوەیەدا بە شایەدی نوێنەرانی حشع بە حەسو یان راگەیاند ئەگەر ئەو نیازی هاتنەوەی هەیە بۆ ناوچەی بەدر یاخود بۆ هەر جێیەکی کوردستانی عیراق ،ئەوا پێویست بە شاخ گرتن و تەقەکردن ناکا چونکە هێزەکانی یەکێتی لە هیچ کوێیەك رێگەی پێ ناگرن ،بەتایبەتی ئەوکاتە لە سلێمانی ولە هەولێر دو رێکەوتنی مەیدانییان لەگەل ئیمزا کرابو ،وە هێزەکانی ئەوان بە ئازادی هاتوچۆیان ئەکرد .

وە نوێنەرەکانی یەکێتی، پەیمان ڕاگەیاند، کە ئەگەر ئەوان لە هاتنەوە بۆ ئێمە ئامادەن بە کۆڵی خۆیـــان
بەتانی و کەلوپەلەکانیشیان بۆ هەڵبگرن بۆ ئەو شوێنەی خۆیان ئیمانەوی لەناوزەنگ، زەڵی، شێنێ، ڕەزگـــە،
مارەد و، قەلاتوکان... یا هەر شوێنێکی تر کە خۆیان حەز ئەکەن بەو مەرجەی هێزی ئێرانی لەگەڵ خۆیان نـە
هێنن.

حەسو بەوپەڕی بێ شەرمییەوە گوتبوی: ئێمە تەعزداری ئێرانین، بۆچی ئێران لەگەڵ خۆمان نەهێنین،
ئێرانیش شەری عێراقمان بۆ ئەکەن... ئەگەر ئێوەش ڕێ بکرن، من بەطولەی توپ ڕێگەی خۆم ئەکەمەوە.

هەر بۆئەوەی کێروگرفتەکە بەخۆشی چارەسەر بکرێ و جارێکی تر شەڕ لە نێوان هێزەکانی یەکێتی وق م دا
هەڵ نەگیرسێتەوە، نوێنەرانی یەکێتی بە زمانی سەرکردایەتی یەکێتییەوە بە حەسویان ڕاگەیاندبو، کە یەکێتی
ئامادەیە نوێنەری ئەوان لە ئاستی مەکتەبی سیاسی یا سەرکردایەتی یا لە هەر ئاستێکی تردا کە ئەوان پەسـە
ندی ئەکەن ببینن بۆئەوەی ڕێ وشوێنی دۆستایەتییەکی بەهێز وپەیوەندییانی هێمنانە دابنێن.

حەسو وەلامی دابوەوە کە ئاگاداری سەرکردایەتی خۆی ئەکات ولێتر دوای ئەو کۆبونەوەیە لەناوخۆیانەکەی
خۆیا لە بەفر وسەعول بەندانی (سەری گردی بەران) بو، وەلام خۆی مات کرد تا ئەوکاتەی کەلە کونەسکەوە
بەرەو کونەکۆتر بەری کەوت و لەوێ سەری خۆی دانا، چونکە هەروەکو ئێستا لە یادداشتەکانی حەسودا دەچێ
ئەکەوێ و لەناوەکەی جاشی ئێستانفروش دا مەسعود بۆ حەسو ساغ بوەتەوە، ق م ئەمک پەیکەوە ژیان، بەڵکو
پەیکەوەدانیشتن و کۆبونەوەش بەتاوان دائەناوە.

حەسو زازوکی دوای ئەوەی لەگوندی تولەی (لەناو بەکرزادان) سەردانی مەسعودی کرد وە وگەڕاوەتـەوە
نەغەدە، ولەوێ لەگەڵ چەند کەسانێک قسەی کرد ووە، لەیادداشتەکانی ڕۆژی ۲۱/ ۳/ ۱۹۸۳ نوسیوەتی:
برادەرەک بە ئێمەی گوت: زانیوتانە کە لێرە دەیانە بەلاو بیووە کە ئەتو گیراوی لەلایەن کاک مەسعودەوە
چونکو گوایا ئەتو بەبێ ئاگاداری کاک مەسعود و م.س چاوت بە جاعەتی جەلال کەوتوە؟ منیش جوابـــم
دایەوە وپێم گوت: مالی بارزان حەقیان، لەسەر ئێمە هەمیە حەسیسان بکەن، دەرمان بکەن، پێمان دادەن.
خۆیان لێمان عاجز بکەن بەلام دروییە ئەمانە هیچ نەبونە وبە.....

دوای برادەرەکە بە ئێمەی گوت: زانیوتانە کە لەتێری دەیانە بەلاو
بیووە کە ئەتو گیراوی لەلایەن کاک مەسعودەوە، چونکو گوایا
ئەتو بەبێ ئاگاداری کاک مەسعود و م.س. چاوت بە جاعەتی
جەلال کەوتوە؟ منیش جوابم دایەوە وپێم گوت: مالی
بارزان حەقیان لە سەر ئێمە هەیە حەیسان بکەن دەرمان
بکەن پێمان دادەن. خۆیان لێمان عاجز بکەن بەلام
درویە ئەمانە هیچ نەبونە بەم [illegible] شێوەیە
مناقەشەمان درێژەکێشا تا درەنگ شەو، نەخەوتین
دوای ماوەیەک گوتی: ئەتو خوا بەس بێت مناقەشەل
ی چییە؟ چونکو ئەمە ئانە [illegible]

۳ — دەستنوسی حەسو زازوکی یادداشتەکانی ۲ /۱۳٦۲ خورشیدی

هەر لەوماوەیەشدا کە حەسو نوێنەرانی یەکێتی دیوە مەسعود نامەیەکی بەتوڕەبونەوە بۆ نوسیوە کەوا کت وبت
ئەمەو سەیتەوە:

برای عزیز حەسو مێرخان زازوکی

پاش سلامان.
کاغەزا تەگەشتە من. وەمر چیا تە نفیسی من زانی. بەهیچ شەرمیکی حەق نەبو هنگە دگەل وان
دانیشن قەیدی نەبوا بو شوان و محمود. ئەما ئەوێت دی ئەم درازی نەبوین. وبە بروسکەش کر بو کو ناپێ
دگەل وان دانیشن. تابا چەوا ئێک دانیشتنە بوبە.
ئەزی جاشەری کات ادرپێ دکەم ئەمەو ئەز بخودی هەم بو ری منطقی و ئەو توشتا من دگەل خـــو
ئینای هەمیی دی ئینم و ئێشا لە هەمو توشتا خو دی ئینخنە منطقا قلمەدزە و رانەی. و نوکە مەم ئـەوە
حراستکا پاش هەمیت لوان جهیت حساس و بو عملیاتا و هیشتا تقدمی ئەز بخودی هەم انشاءالله.
گرتنا ئەو نقطا سەری جاسوسان پشتا دوژمنا شکاند و ئەز سوپاسا هەمیا دکەم بیت زەحمەت کێشای و

## هاشمانی جود :
## چۆن دەسکێشی هێزەکانی ئێران دەبن ،
## بۆ ئەوەی کوردستانی عێراق بکەن بە مەیدانی جەنگ ؟

یەکێك لە هۆکرنگەکانی مانەوەی گەلی کورد بە دواکەوتوویی و کوردستان بە وێرانی ، شوێنی ستراتیجی کوردستان بوە کە کەوتۆتە سەرجەقی رێگای هاتوچۆی لەشکرە گەورەکانی رۆژهەلات و رۆژئاوا و بۆتە مەیدانی شەر و ململانێ ، لەشکرەکانی یۆنان و فارس وعەرەب و مەغول وتورك لەکوردستانەوە رەت بون و هەموجار کوردستانیان کردۆتە مەیدانی جەنگ لەگەلّ هاتن و چونی خۆیاندا ، کوردستانیان وێران کردوە ، سەروەت و سامانیان تالاّن کردوە ، کشتوکالّ ورەز وباخ و ئاوەدانیان کۆتە کردۆتەوە ، مێژوی مرۆییمان قڕ کــــردوە و نیشتمانەکەیان لەکۆنی خوێن دا نوقم و لە چەرەد وکەلّدا رەش کردووە •

ئەم رودا وانە لە مێژوی نەتەوەی کوردا چەندین جار دوبارە بۆتەوە و ، لەسەردەمی دەسەلاّتی عوسمانی و دەولّەتە ئێرانیەکاندا ئەوەندە دیار و ناخۆش بون کە هەم مێژو نوسی پایە بەرزی کورد شەرەف خانی بەتلیسی لە ( شەرەفنامە ) دا وە هەم فەیلەسوفی مەزنی کورد ئەحمەدی خانی لە ( دیباچەی مەم وزین ) دا بە چاکی و زۆر بەئازارەوە رونیان کردۆتەوە •

گەلێك جار میر و دەرەبەگەکانی کورد لە پێناوی ئازانجی تایبەتی خۆیاندا ومیژئەوەی بە یارمەتی بێگانـــە خۆیان بسەپێنن بەسەر خەلّکی دا بەعەشیرەت لەدژی عەشیرەت وکور لەدژی باوك ، برا لەدژی برا و ئامۆزا لــە دژی ئامۆزا بونەتە دەسکێشی سوپای داگیرکەری بێگانە و لەشکری وێرانکەری بیانییان بەناو کوردستانـــدا وەرکردوە و بونەتە مایەی فیتنەی خوێناوی کورد بەکورد بەکوشتندان و وێرانکردنی شار و ئاوایەکانی کوردستانا •

مێژوی میرنشینەکانی بابان و سۆران و ئەردەلاّن و بادینان وجزیرەو بۆتان وهەکاری و ••• هتد ، پڕن لە نمونەی ئەو جۆرە دەسکێشیانە ، بەیەکەمین جارە لە مێژوی گـــــەلی کوردا کە گەلی کورد لەماوەی ( ٣ ) سالی رابردودا بتوانی خوی لە شەر وکێچەل و مالوێرانی جەنگی کاولکەری دو دەولّەتی ناوچەکە ( واتــــە ئێران وعیراق ) بپارێزی ، وە لەسایەی شۆرشەوە لە هەر دو دیوی کوردستان ئەھیلی رولەکانی ببنە سوتەمەنی شەر و گەلەکەی ببێت بە ژێر دەستەیی داگیرکەرانەوە و شار و ئاوایەکانی ویران ببن ، کە ئەمە خوی لە خویدا سەروەرییەکی مەزنە بو شۆرش •

بەلاّم سەیر ئەوەیە لە ئەوەی دوەی چەرخی بیستەمدا پاش ئەو هەمو دەرس و پەندانەی لە مێـــــژوی دوڵەمەن و پر لەتاقیکرد نەوەی کوردا هەیە ، هێشتا خوفروشانێك هەبن بو ئازانجی شەخسی و دەسکەوتـــی عەشیرەتی خویان ببنە نوکەری رەزیل وسوکی بێگانە و دەسکێشی داگیرکەر بوسەر خاکی کوردستان •

حەسو میرخان ژاژوکی لە یادداشتەکانی پێنج شەممە ١٣ی مورداد بەرانبەر ٤ ی ئابی ١٩٨٣ لــە کاتی سەردانەکەی دا بولای ئیدریس بەرزانی لە ( هەواری سەیدان ) و روژی دوایی تر لە ( بەردەپان ) ی پشتی ( کونەلاجان ) ئێران نوسیویەتی :

••• بە خوم چومە لای کاك ئیدریس بارزانی با بزانین داخوا ئیجازەی ئیمە نادەت بەلاّم دیاربو رای خوی بو کاك مسعود نوسی بو دەربارەی ئیمە جواب نەهاتبووە بەبێ ئاگاداری کاك مسعود ایشەکەی ئیمەی جێبەجێ نەدەکرد • بەلاّم تا ئیمە لەوێ بوین چەند بروسکەیەك هاتن لەوان بروسکان یەك ئەوەبو کە دەولّەتی ئێرانی هجومی چهای کرد هەندێك کرد بوە گرتویەتی و دەولّەتی عیراقی زور شەپرزە بووە • لەوی لەگەل جماعەت هەندێك گفتوگومان پێکەوە کردن دوای ماوەیەك جماعەت هەمستا هاتەوە من لەلای کاك ئیدریس مامەوە کردمانە باسی ئەم موضوعانەی خواری : کاك ئیدریس گوتی :

هەندێ من ئەوەیە دەولّەتی ئێران ، بالعکس وسید مکان وناوچەی پشدەری پاك بکەنەوە وە ئەو مالانەی لە ئێرانن ( عقدە وزیوە ) بگوێزنەوە بو ئەو ناوچانەی ئازاد کراون ئەوجا مـــــن

دەبوکرانەوە،باش ئەوەی ئەو ئەرکە ناشیرینانەیان لەود بو ئەنجام دا ،ئینجا کەوتنە شەر فروشتن بە یەکیتی نیشتمانی کوردستان و هیزەکانی خویان لە تالآن کردن رکونەنەك بەرانبەر بە بارەگاکانی سەرکرداییەتی ی.ن لە لەناوزەنگە،زەلی،شینی ...کوکردەوە .

دیسان ئەوەچەند مانگە هەموو هەول و تەقەلای خویان و هەموو هاوپەیمانەکانی تیان لە جودا تەرخان کردوە بو قاییم کردنی کاربەدەستانی ئیرانی کە شەر بگویزنەوە بو کوردستان بە بەهانەی ئەوەی کە گوایا هەموو خەلکی کوردستان لەگەل ئەوانە وهەر بەگەیشتنیان هەموو خەلك بە پیشوازی ئەوان و لەشکری داگیرکەری ئیرانەوە ئەچی وچەکیان بو هەل ئەگرن ؟

حەمە زازوکی لە یادداشتەکانی خوی دا لەسەر کاتی کاتوانی،ناوچەی مەنگوڕایەتی لەوبارەیەوە بەم جوانی نوسیویەتی !.

چوارشەممە ٥ی مورداد بەرامبەر ٢٧ی تەمموزی ٨٣

بەیانی زو هەستامەوە چومە سەرکانی تماشەی ناوچەی پشدەری و سەنگەسەر کرد کومکو اپنەی لە پیش چاوانی بو کەوتە فکرکردنەوەی وەزعی رابردوی خومان کە چون کاتی خوی خەلکی ئەم ناوچەیەی کرنوشی بو ئیمە دەبرد وچون دووبەدوور ئیمەیان کەرو گوێ کرد بوون لەنامە ونامەکاری ئەمروش ئەم خەلکە چون خو لە ئیمە دەوور

[illegible]

Wed. 27 July

چهارشنبه ٥ مرداد

١٦ شوال

[illegible]

٧ ــ دەستنووسی حەمە زازوکی

یادداشتەکانی ١٣٦٢ خورشیدی

دوشەممە ٣ ی مورداد بەرانبەر ٢٥ تەمموز

ئەمڕۆ لە مقەڕی لە سێلوی بووم فڕۆکەکانی عێراقی ئەوەبوو ماوەی سێ ڕۆژە کە دێنە ناوچەی خانەوە ناوچە بۆمباران دەکەن بەلام تا ئیستاش کە چەند جار لە دەورپشتی ئێمەی داوە خۆشبەختانە زیانی گیانی نەبووە تەنیا دو نەفەر لەخانەدار بریندار بوونە •

سێ شەممە ٤ ی مورداد بەرانبەر ٢٦ تەمموز

ئەمڕۆ لەمقەڕی لە سێلوی بووم • شەڕی ئێران وعێراق هەر درێژەی هەیە دوێنێ ئێران دەربەندی لەدەست عێراق دەرهێنا •مەسعود بارزانی لە کونەلاجانەوە وە ئیدریس بارزانی لە قەندیلەوە ،کە لەبەر ئەو شەڕەی دوای ئێران وعێراق جێی خۆیان گواستۆتەوە وە هەتا پێشمەرگەی ئێمەش ..لەم شەڕەدا بۆ شارەزایی بەشداریمان کردووە•

جمعە ٧ مورداد بەرانبەر ٢٩ تەمموز

ئەمڕۆ لە مقەڕی بووم بەیانی ئەحمەد خەلانی هاتە ئێرە لەگەڵ مەلا عبدوللا کە بچێتە عێراق بۆ ئەوەی تا وتەقسیمی بکەینە جماعەتی مەلازم بابکر وە ئەوەش مەلا عبدوللا وە عباس وعەزیز حەمۆ لەگەڵیان چوون بۆ عێراق کە چەند ولاغی گوندیان بۆ لە خەلک وەرگرتن وە ئەو تەنیا باتیمان بۆ گواستەوە بۆ عێراق ؟

یەکشەممە ٩ مورداد بەرانبەر ٣١ تەمموز

ئەمڕۆ بەیانی مەسعود بارزانی هاتە سێلوی کە لیژنەی بەرزی بەرەی نیشتمانی کۆبوونەوەی خۆی لە سێلوی دەست پێ کرد ،ئێوەش مام سرکە لەگەڵ چەند نەفەر لە چەکدارەکانی سۆسیالیستەکان شەڕی کرد بەسەلام لێدانی خوارد •مەسعود بارزانی لە سێلوی گەڕایەوە بۆ کونەلاجان وەیان شێناوی • ئێران لە مەهران هێرشی بردە هێزەکانی عێراقی کە زۆر لە خاکی خۆی لە عێراق وەرگرتەوە•

دوشەممە ١٠ مورداد بەرانبەر ١ ئاب

ئەمڕۆ بەیانی کە سەرهەنگ نیاکانی هات بۆ سێلوی وە داوای دەکرد کە جادەی لە سێلوی بهاتەوە هەلکورد وە من و سالم عارس ی لەگەڵ خۆی بردە یادگانی خانی وە لەپاشان ئیمە چووینە شێناوی وە لە وێشەوە چووینەوە سێلوی •

١١ ـ دەستنوسی میرخان حاجی میرخان

یادداشتەکانی ١٣٦٢ خورشیدی

MAY شوال مرداد

Fri. 29 ١٨ ٧ جمعه

[illegible]

Sat. 30 ١٩ ٨ شنبه

[illegible]

MAY شوال مرداد

Wed. 27 ١٦ ٥ چهارشنبه

[illegible]

Thurs. 28 ١٧ ٦ پنجشنبه

[illegible]

میرخان لێرە بەدواوە لەیادداشتەکانی دا باسی ئەوە ئەکات کە چۆتە ناوچەی ئالوتان بنکەی پێشمەرگەی حەسیۆ و لەوێوە لەگەڵ چەند کەسێکی تر بەکانی موزەرە و هەوارەکانی خوار ،کوترەل ،بەرتەنگ،بەرخلیسلە،تاتی دۆ،

کچە ملان ، گورتسوی ، ئینجا بۆ گوندی ئاشقوڵکە ، قرناقاو ... وە ڕۆژی دوایی گەیشتینە لای هێزەکەی مامی (واتە حەمسو زازۆکی ) لە چیای بیبە و بەم جۆرە دریژە بە یاد داشتەکانی ئەدا !

دوشەممە ٣١ مرداد بەرانبەر ٢٢ ئاب

ئەمرو بەیانی لەگەڵ خەلیل غەزالی وە حەسەن ئەحمەد عەلی لە قرناقا و چووینە سەر شاخی پشت لەنزی وە بەرانبەر بە چیای قەندیل مام حەمسو و جماعەت لەوی بوون کە بەرانبەر بە چەکدارەکانی جەلالیەکان ڕاوەستاون کە پێشمەرگەی عبد الرحیم جەسیم وە حەمسو میرخان دولەمەری وەحزبی شیوعی و حزبی سوشیالیست و جماعەتی لەگەڵ یەکی یان لەبن .

سێ شەممە ١ شەهریوەر بەرانبەر ٢٣ ئاب

ئەمرو لەسەر شاخی سەری بی بی ( پشت لەنزی وە لەوێوە ماینەوە ، شەڕ لەگەڵ چەکدارەکانی جەلالیەکان هەر دریژەی هەیە ، کە ئەمرو پێشمەرگەکانی بەرەی نیشتمانی لەسەر جادەی کە لە دۆڵی شەهیدان وقەسری شکان و پاشەکشەیان کرد ، بەڵام لەوەجە بیبیە هەر دریژەی هەیە وتەقە جار جار لە یەکتری دەکەن بەڵام لە حزبی شیوعی ٢ دو کوژراوە حزبی سوشیالیست ٣ سێ کوژراویان هەیە .

چوارشەممە ٢ ی شەهریوەر بەرانبەر ٢٤ ئاب

ئەمرو لەسەر شاخی بی بی بووم لەگەڵ جماعەت وە مام حەمسو لەگەڵمان بوو؛ میرجان غەزالی وە عطی حەمسو لە قرناقا وەڕوونەوە بۆ نەغەدە ، چونکە ئاوری میوان هاتونەوە بۆ دەرەوە کە بچێت بۆ خوێندن ، لە بەیانی بروسکەیەکی مەکتەبی سیاسی پارتیمان لەدوای هاتبو گەیچیتەوە .

پێنج شەممە ٣ ی شەهریوەر بەرانبەر ٢٥ ئاب

ئەمرو هەر لەسەر شاخی بی بی بووم لەگەڵ جماعەت کە نیوەی زیاتر بە دەست پێشمەرگەکانی ئێمەوەیە وە هەندێکی تر بەدەست جەلالیەکانەوەیە کە بەرانبەر یەکتر جبهەیان بەستووە ، وە ڕۆژ بەرۆژ تەقە لەیەکتر دەکەین لە یەکتر دەکوژین ئەوەش دەردی ڕەشی کوردمان دەرمان ناکا . بەڵکو بڕینی زیاتر و برینداراتر دەکات؛

جمعە ٤ شەهریوەر بەرانبەر ٢٦ ئاب

ئەمرو هەر لەسەر شاخی بی بی بووم . شەڕی ئێمە و جەلالیەکان هەر دریژەی هەیە . پێش ئەمڕۆ چەند عەسکەری ئێرانی هاتنە لای ئێمە وە بە ئێش هاتبون کە دەمانەوێت شارەزایی لەناوچە پەیدا بکەن بۆ ئاژانجی تایبەتی خۆیان وە نەخشەی لێ بگرن .

AUGUST

AUGUST

Sun 28

Mon 29

١٣ ــ دەستنووسی مەرخان حاجی مەرخان لەیادداشتەکانی ١٣٦٢ خورشیدی

هەروەکو لەم یادداشتانەدا دەرئەکەوێ جاشەکانی ئیادە لە هەرشەکەی حاجی ئومەراندا بە جۆرێکی راستەوخۆ بەشدار بوون ، لەناو بەشدارەکاندا جگە لە ملازم عەلی (عومەر عوسمان چەکول) و ملازم ئەبوبەکر (سەردار ئەبوبەکر عەلاف) چەندین هەرچی و پەرچی وەکو نجم الدین کوروونی و مستەفا و حەمەدی برای و مامەندی مەس خەلی ، ئەحمەد خەلانی ، ئەحمەد کشخە ، قادرە سووری روستایی ، رەسوڵ ئەحمەدی ناوەندەیی ؛ بوون بە هاوسافی هێزەکانی ئێران لە کۆڕ و گردەمەند پڵ و ڕابات و ئازاد کرد مریەند و بوون بە دەلیلی دەستەی بەهاوساقی هێزەکانی ئیران لە کۆدۆ و گردەمەند پل و ڕابات و ئازاد کرد مریەند. و بوون بە دەلیلی دەند مهان ( رەصد ) ی تۆپخانەی ئێرانی و بەوجۆرە هەزاران خەیزانی کورد لە بالەکایەتی ئاوارە و دەربەدەر بوون و چەندین شار و شارۆچکەی وەکو دەربەند و ڕابات و جۆمان و تەمەرێ لەبەر تۆپ بارانی ئێرانی چۆڵ کران .

هاوزەمان لەگەڵ هەرشەکەی ئێراندا بۆسەر ناوچە و مەحوەری حاجی ئومەران ، جاشەکانی جود یش بە نیازی دەرکردنی ی ن ك لە مەیدانی خەباتی شۆڕشگێڕانە ، وەبوکرتانەوەی ؛ رەلانەوەی کورد بە تەخشە و بەلانی بێگانەوە ، کەوتنە خوسازدان و کۆکردنەوەی جاشەکانیان لە مانگی حوزەیرانەوە خۆیان ئامادە کرد بەو هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەم هەرشەدا ، کە ئەمانیش پەلاماری چیای قەندیل و بالەکایەتی و ئاکۆیەتی و مەنگوڕایەتی و پشدەر بدەن بە تایبەتی چونکە ئەم شوێنانە لەبەر سەختی و دژواری ناوچەکە و هەبوونی کوێستانی بەرزی وەکو چیای سەخت و دۆڵی قوڵ و نەبوونی ڕێگای هاتوچۆی ئاسان و نەبوونی جادەی هێنان و بردنی ( الیات ) ی ئێرانی ، ئەمو هەر بە بنکۆ داگیر بکرێن .

لە دوای ئەو کۆبوونەوەیەی لیژنەی باڵای جاشەکانی جود کرد بوو یان یەکێک لەو بڕیارانەی داویانە لە ناوبردنی ی ن ك بوو . حەسو زاروکی لە یادداشتەکەی دا نووسیویەتی :

چوار شەممە ١٨ ی خرداد بەرانبەر ٨ ی حوزەیران

بەیانی زو هەستامەوە چوومە لای برادەرێکی پێم گوت : ئێوە کەی لە نەندەی هاتوونەوە؟ جوابی دامەوە دوێنێ ، پێم گوت : دەنگوباس چی هەیە ؟ جوابی دامەوە گوتی : بەیانی قوەتێك دەگاتە جی دەیەیانەوێت دەیت ، لە ڕێگای ناوەشت و ناوچەی بالەکیش هەرخەیەکی کوکرد ئەوەی تومتن کە زمانەی عیراقی بکەن وا کاك مەسعود و کاك ئیدریس خەریکی خۆئامادە کردنن کە بێن بۆ ئێوە . پێم گوتن : وەکو دەزانن خەریکی شەڕن یان نە ؟ جوابی دامەوە : کاکە گیان ئەوەی ئێمە دەلێین کاك ئیدریس و کاك مەسعود عەینی قسەی دەکەن و رایان وایە ئەگەر جەلال لەناو نەبەن ئاتوانن شۆڕش بکەن . . .

١٤ ـ دەستنووسی حەسو زازوکی
یادداشتەکانی ١٣٦٢ خورشیدی

چهارشنبه ١٨ خرداد
Wed. 8 June
٢٦ شعبان

هەروەها حەسو زازوکی لە کۆبەندی پوداوەکانی مانگی خورداد ا واتە بەشێکی مانگەکانی مایس وحوزەیراندا، هێشتا لە کونە مشکێ دەشتی وەزنێی لای سەرد مشت بوە ، نووسیویەتی :

ئەم مانگەی رابردو ئەم شتانەی خواری تێدا روداون :

١) قورتی ئیمە لە جەبهەی تالوەتان زیاد کرد بە نیازی حەرەکەت کردن بو داخلی عیراق وە لەناوبردنی قورتی جەلال لەناوچەی

٢) هەیئەتێك لە دەولەتانی خلیج فارس بەیەك هات وە کەوتە هاتوچوکردن لە بەینی عیراق و تهران بو دوزینەوەی ریگایەك بو هاتوچوکردنی گەشتی توجارەت لە اوی خلیج فارس وە هەولدانی بو راوەستاندنی شەری عیراق و تهران .

٣) بەرەی نیشتمانی (جود) یانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق ، حزبی شیوعی عیراق وحزبی سوسیالیستی کوردستان عیراق و پارتی سوسیالیستی کورد قەراریان داشەری مان ونمان لەگەل جەلال و تاقمەکەی بکەن وە کاك ئیدریس بارزانیان کرد ، قائدی حەرەکە (مسولی سوپا) وە کاك مسعود بارزانی کرایە قائدی عام بزوتنەوەی کورد .

٤) حیزبی شیوعی عیراق و حیزبی سوسیالیستی کورد ستان عیراق به جوداگانی بیانیان لەسەر تاقمەی جەلال ( یەکێتی نیشتمان ) دەرکرد وە خەیانەت و جاشەتیان بە پالدا ( لە اداعەی پارتــــــی خوێند رایەوە ) .

٥) جەیشی تورکیەی ١٥ کیلومیتر داخلی خاکی عیراقی بو لە کورد ستان عیراق بو سەرکوتکرد نــــــی بزوتنەوەی کورد لە عیراقی لەسەر رەزامەندی دەولەتی عیراق .

٦) دو پێشمەرگە لەسەفەری من خەیانەتیان کرد و التحاقیان بە دوژمن کرد .

٧) کەسێنەك لەلای تاقمەی قاسلوی دانراوە بو قومتی ئیمە لە خانەی ٧ شەهید و ٨ بریندار یان دان.

٨) دەولەتی ئێران بە ریگای سەرد مشت و قەلادزەی حەرەکەتی کرد گەشتە سنوری عراق و تاقمەی قاسلوی شکاند .

ئەم مانگە رابردو ئەم شتانەی خوارەوە تێدا روداون :-

① قوەتی ئێمە لە [illegible] زیاد کرد بە تازە [illegible] لە داخلی عراق وە لە [illegible] قوەتی جلال لە [illegible]

[illegible]

⑧ دەولەتی ئێران بە ریگای سەردەشت و قەلادزە [illegible] کرد گەشتە سنوری عراق و تاقمی قاسملوی شکاند.

بەبۆنەیە ئیدریس و مەسعود کە بونەتە فەرماندە و سەرگەورەی جاشەکانی جود و جاشەکانی جود یش هاوڕێ لەگەڵ هێزەکەی ئێراندا بوسەر حاجی ئومەران کەوتنە ڕێ بەرەو ناوچەکانی سنور ، ئیدریس چەند بن نەفەر پاسدار و نەفەر و دەرەجەدار و سەربازی لەگەڵ هێزی جاشەکانی جود ناردە دیوی کورد ستانی عیراق و ..

١٥ ـ دەستنووسی عومەر [illegible]
یادداشتەکانی ١٣٦٢ خورشیدی

